یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی دووەم

16

ئەیلولی 2009



# گرنگترین نهێنی سەرکەوتن و شادمانی چییە؟

## دوژمنانی کات!



# باشترین شێوازی کارگێڕی

## چاوەڕوانی کاری باشی لێ مەکە!

## ئەنفلۆنزای ژیری!

## لاساری منداڵ

## هاوڕێکەت تاقیکردۆتەوە؟!

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

# بریار

مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی دووەم – ژمارە 16 - ئەیلولی 2009

























## خاوەنی ئیمتیاز

ئەندازیار مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی

## سەرنووسەر

عادل محەمەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com
07705033131

## سکرتێری نووسین

بەرزان ئەبوبەکر

## بەڕێوەبەری پەیوەندییەکان

محەمەد هاشم

## دیزاین

جەمال دەروێش

قەیدار رەحیم

## راوێژکاری یاسایی

پاریزەر: ئازاد محێدین

### مەرجەکانی بڵاوکردنەوە

داوا لــە هەمــوو ئــەو ئازیزانــە دەکەیــن کــە بابەت بۆ گۆڤارەکەمان دەنێرن رەچاوی ئەم خاڵانە بکەن بە پێچەوانەوە هەر نووسینێك ئەم خاڵانە رەچاو نەکات پشتگوێ دەخرێت.

١- نابێت لە نیو لاپەرەی (A4) بە فۆنتی (١٢) کە متر بێو لە دوو لاپەرەش زیاتر بێت.

٢- دەبێت ئاماژە بە سەرچاوە بکرێت لە هەر دوو حاڵەتی وەرگێران‌و نووسیندا.

٣- دەبێت نــاو یان نازناو بنووســرێت، نازناوی باوك یان دایك پەســەند نییەو هیچ بابەتێك لێرە بە دواوە بەو نازناوە بڵاوناکرێتەوە.

٤- بابەتەکە بە ئیمێل بنێردرێت‌و ژمارەی مۆبایلی لەسەر بێت.

٥- ئــەو بابەتە یەکەمجار بێت بڵاو بکرێتەوەو پێشــتر لە هیچ گۆڤارو رۆژنامەیەکی تردا بڵاو نەکرابێتەوە.

## ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی- شەقامی سالم- تەلاری سلێمانی مۆڵ، نهۆمی/2
بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە
07702178682 3193946
E-mail: bryarmagazin@gmail.com

هەولێر- شەقامی گولان بەرامبەر دەزگای ئاراس
07504463230 07507658535

حساب بانکی گۆڤاری بریار
بانکی کوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی: ٣٣٧١



تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

چاپخانەی سەردەم

# جەژنی رەمەزانتان پیرۆز

باڵەم جەژنەدا

دەستی برایەتی و خۆشەویستی یەکتری بگوشین و

خۆشی و شادی بخەینە نێو دڵان،

باڵەم جەژنەدا

هەژاران و بێ نەوایانمان لەیادنەچێ و

بەسەریان بکەینەوە.



# سیستەمی خوێندن سیستەمی ژیان

سەرنووسەر

پێشکەوتنی سیستەماکانی خوێندنو پەروەردەو هەماهەنگیان لەگەڵ داواکارییەکانی سەردەمو داواکارییەکانی ژیانی ئەمرۆی کۆمەڵگادا، خاڵێکی سەرەکیو بناغەییە بۆ وەرچەرخانی کۆمەڵگا رووەو پێشکەوتنو گەشەپێدان.

چونکە سیستەمی خوێندنو پەروەردە رۆڵێکی باڵای هەیە لەسەر دروستبوونی نەوەی نوێو ئاستی رۆشنبیریو زانیاریو تێگەیشتنیان بۆ ژیان.

رێژەی ئەو کەسانەش کە لە چوارچێوەی ئەم سیستەمەدا کاردەکەنو پەیوەندیدارن بە قوتابیو خوێندکارو مامۆستاوە زۆر جار دەگاتە زێتر لە نیوەی ژمارەی دانیشتووان، وێرای ئەوەی کە لە کۆمەڵگای خوێندەوارو پێشکەوتووخوازدا نیوەی تریشی بەو سیستەمەدا تێپەریووە.

هەموو ئەو کەسانەش کە سبەینێ لە هەر بوارێکدا درێژە بە خزمەتکردنی ئەم وڵاتە دەدەن، سیستەمی پەروەردەو فێرکردن کاریگەرییەکی زۆری دەبێت لەسەر شێوازی هەڵسانی بەو کارەی کە دەوڵەت پێی دەسپێرێت.

وڵات پەروەری، خۆشەویستیو رێزگرتنی هاوڵاتیان، رێزگرتنی یاسا، باوەر بوون بە ئازادی رادەربرینو مافی بەرامبەر، دوورکەوتنەوە لە هەموو شێوازەکانی توندوتیژیو ئازارو ئەشکەنجەدان، هەموو ئەم بەهایانە دەبێت مرۆڤ هەر لە باخچەی ساوایانەوە فرچکی پێوەبگرێت!

بۆ سیستەمێکی سەرکەوتوو لە خوێندنو پەروەردەدا پێشنیار دەکەم:

١- پێویستە سیستەمی خوێندن بە هەموو دامەزراوەکانییەوە سەربەخۆ بێتو وەکو گەنجینەیەکی بەهاداری نەتەوەیی سەیر بکرێتو لە هەموو دەست تێوەردانێك بە دوور بێت.

٢- گۆرینو بەرەوپێش بردنی سیستەمی خوێندن، بە دەستێوەردانی سیاسیو لاسایی کردنەوەی سیستەمەکانی وڵاتانی تر نابێت، بەڵکو پێویستە چەندین سەنتەری لێکۆڵینەوە بۆ ئەم مەبەستە ئامادە بکرێت.

٣- دانانی کەسانی پسپۆرو شارەزا لەسەر هەرەمی کارگێری لە هەموو دەزگاکانی پەروەردەو فێرکردن، پێویستە کارێکی فەرمی بێتو جەختی لەسەر بکرێت.

٤- حکومەتی رۆشنبیرو پێشکەوتووخواز بودجەی هەرە گەورە بۆ فێرکردنو پەروەردەو زیادکردنی ژمارەی قوتابخانەو پەیمانگاو زانکۆکان دابین دەکاتو هەمیشە ئەو وتەیەی لەبەر چاوە کە دەڵێت: (هەر کاتێك قوتابخانەیەکت کردەوە، ئەوا بەندیخانەیەك دادەخەیت).

٥- مسۆگەر کردنی ژیانو گوزەرانی مامۆستایانو کارمەندانی دامەزراوەکانی پەروەردەوفێرکردن کە بە داخەوە تا ئێستا وەکو پێویست گرنگییان پێ نەدراوەو زۆربەی مامۆستایان تا ئێستا کێشەی نیشتەجێبوونو نزمی موچەو نەبوونی ئیمتیازاتیان هەیە.

٦- دانانی پرۆگرمی خوێندن کارێکی گرنگەو بە لیژنەی وەهمیو کەسانی نەشارەزاو بێ بروانامە یا بە رێکەوتن لەگەڵ کۆمپانیا بیانییەکاندا بەرێوە ناچێتو شتی نارێکی لێ دێتە بەرهەم.

٧- گرنگیدان بە لایەنی پەروەردەو سلوکی، کە بەداخەوە زۆرجار پەروەردە تەنها وشەیەکە بۆ جوانی خراوەتە پێش وشەی فێرکردنەوە!

٨- بەهێزکردنی لایەنی پراکتیکیو دروستکردنی کتێبخانەو تاقیگەو وەرشەو یاریگا بەشێوەیەکی بەرفراوان.

٩- دروستکردنی رۆحی داهێنان لە ناخی قوتابیانو خوێندکاراندا لە هەموو بوارەکانی *زانستیو وێژەییو کشتوکاڵو پیشەسازیدا!*

١٠- گرنگیدان بە خوێندنی پیشەیی، کە بەداخەوە وێرای گرنگی ئەم بوارە تا ئێستا لە وڵاتی ئێمە بە چاوێکی نزمەوە سەیر دەکرێت.

١١- بەکارهێنانی شێوازە مۆدێرنو ئامرازە پێشکەوتووەکانی جیهانی پەروەردەو فێرکردنو دەرچوون لە قاڵبی کلاسیکی کۆن.

١٢- گرنگیدان بە بواری تەندروستی قوتابیان بە دابینکردنی جلوبەرگو خۆراکی تەندروستو سیستەمێکی ورد بۆ چاودێری تەندروستییان.

١٣- گرنگیدان بە قوتابخانەی گوندەکانو پێدانی ئیمتیازاتی زیاتر بە مامۆستای گوند.

ئەم پێشنیارانە زیاتر خوێندنی بنەرەتی دەگرێتەوە، خوێندنی ئامادەییو زانکۆش دوچاری کێشەی زۆر بووەتەوەو پێویستی بە قسە لەسەر کردنو لێکۆڵینەوەو چارەسەرەو لە داهاتوودا تیشکی دەخەینە سەر.

بەهیوای سیستەمێکی پێشکەوتوو بۆ خوێندن.

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەو میللەتەی خاوەنی هیچ بیرو باوەڕێک نییە، لاوازە بەرامبەر دوژمنانی!
ئەسکەندەری مەقەدۆنی

خوێندنەوە پێویستە بۆ ژیان، وەک هەڵمژینی هەناسە!
ئەلبرتۆ مانغویل

ئافرەت نیگەرانە بۆ ئایندەی تا هاوسەرێکی دەست کەوێت، بەڵام پیاو نیگەران نییە بۆ ئایندەی تا ئەو کاتەی هاوسەرێکی دەست دەکەوێت!
بەرناردشۆ

یان ڕێگایەک دەبینینەوە، یاخود ڕێگەیەکی نوێ دەکەینەوە!
هانیباڵ

ئەگەر پەلکە زێڕینەت دەوێت، دەبێت بەربارانت قبوڵ بێت!
دولی بارتۆن

ئەوەی بە ڕێکو پێکی دەستی بە ڕۆیشتن کرد، نیوەی ڕێگاکەی بڕیوە!
ئەرستۆ

ئەوەی قوتابخانەیەک بکاتەوە، بەندیخانەیەک دادەخات!
ناپلیۆن پۆناپارت

هەڵبژاردنی ڕێگاکانی پەروەردە، گرنگترە لە هەڵبژاردنی شێوازی حکومەتێک.
گۆستاف لۆبۆن



## کارگێڕی بە چیرۆك

# چاوەڕوانی کاری باشی لێ مەکە!

لە ئەفسانەیەکی هیندی دا کە مێژووەکەی بۆ سەدەی شازدە دەگەڕێتەوە هاتووە کە باس لە دوپشك‌و کیسەڵێك دەکات کە رووبارێك رێگای لێگرتبوون‌و دەبوایە ئاوی رووبارەکەیان بڕیباو گەیشتبانە ئەوبەری زێ.

ئەم کارە بۆ مام کیسەڵ ئاسان بوو، دەیتوانی بە مەلە ئەو رێگایە ببڕێت، بەڵام دوپشك نەیدەتوانی ئەم کارە بکات، بۆ ئەم مەبەستەش زۆر تکای لە کیسەڵ کردو لێی پارایەوە کە لەسەر پشتی خۆی بیپەڕێنێتەوە، زۆر بە کزۆڵییەوە تکای لێ دەکردو دەیگوت: من هەرگیز ئەو پیاوەتییەی تۆم بیرناچێت‌و بە باشترین شێوە پاداشتی ئەو پیاوەتیەت دەدەمەوە!

کیسەڵەکە لە وەڵامدا وتی: ناتوانم لەسەر پشتم بتپەڕێنمەوە، چونکە تۆ پێمەوە دەدەی!!

دوپشکەکە بەسەرسورمانەوە گوتی: بۆچی ئەم کارە بکەم، تۆ مایەی رزگاربوونی ژیانی منی.. هەر کاتێك من بە تۆوە بدەم ئەوا هەردوکمان بەیەکەوە نوقمی ئاوەکە دەبین‌و تیادەچین، نا ئازیزەکەم هەرگیز کاری واناکەم.

کیسەڵ گوتی: مادام تۆ ئەو قسەیە دەکەیت‌و ئەم بەڵێنەم پێ دەدەیت، لەو بڕوایەدام راستیش دەکەیت، کەواتە هیچ بەهانەیەکی ترم نەماوەو فەرموو سواری پشتم بە، با بڕۆین!.

دوپشکی بێ بارو بێ پەیمان سواری پشتی کیسەڵ بوو، کەوتنە رێ بۆ بڕینی ئاوی رووبارو گەیشتن بە ئەوبەری رووبارەکە، کاتێك خەریك بوو دەگەیشتنە ئەو بەرو هێواش هێواش لە کەنار نزیك دەبوونەوە، لە ناکاو کیسەڵەکە هەستی کرد دوپشکەکە بە چزووی ژەهراوی خۆی زیرەی لێ هەڵساندو پێوەی دا!

لە کاتێکدا کە هەردووك خەریك بوو نوقم دەبوون‌و بەرەو خنکان لە ئاوەکەدا رۆدەچوون، کیسەڵەکە ئاوری دایەوە بۆ لای دوپشکەکەو پێی گوت: تەنها وەڵامی یەك پرسیارم بدەرەوە: بۆچی ئەو کارەت کرد؟ دەمەوێت هۆکارەکەی بزانم؟!

دوپشکەکە بەشەرمەزاری‌و پەشیمانییەوە گوتی: «چی بڵێم، نەمتوانی خۆم بگرم لەو کارە، چونکە ئەوە سروشتی منە!!».

لەم چیرۆکەوە فێردەبین کە:

١- لە کەسانی دوپشك ئاساوە تەنها چاوەڕوانی کاری خراپ دەکرێت‌و هەرگیز کاری باشیان لەدەست نایەت.

٢- بە بەڵێن‌و قسەی چەوری ئەو کەسانە فریو مەخۆ، چونکە تەنها شتێکی کاتییەو پاش ماوەیەکی کەم دێتەوە سەر سروشتی خۆی.

٣- بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت هاوڕێی باش هەڵبژێرەو وریابە دوپشکەکان نەکەیت بە هاوڕێ، چونکە لە ناسکترین کاتدا چزووەکانیان دەردەهێنن.

٤- بۆ ئەوەی وریا بین‌و هۆشیارانە هەنگاو بنێین، لە گەردوندا باش‌و خراپ سودمەندو زەرەر مەند کۆتری ئاشتی‌و دوپشکی ژەهراویش هەیە، کەواتە دەبێت وریای دەورو بەربین.

٥- پێویستە زۆر لەوە زیرەك‌و وریاتربین کە ئەو جۆرە کەسانە بتوانن فریومان بدەن‌و لەسەر پشتمان بپەڕنەوە.

٦- نابێت ئەوەندە سادەبین کاتێك دوپشکەکان قسەی خۆشمان بۆ دەکەن کردارەکانیان لە بیر بکەین.

٧- دوپشکەکان هەر دوپشکن‌و ناتوانن سروشتی خۆیان بگۆڕن، تەنها بە قسەی چەورو شیرین خەڵکی فریو دەدەن.

بەشی پێنجەم

# سەرەتایەك لە زانستی ڕێکخستن

لــە ژمــارەی رابــردوودا یەکــەم بنەمای ڕێکخستنمان باس کرد کە ئەویش جیاکەرەوەی ڕێکخســتن بوو، لەم ژمارەیەدا بنەمای دووەم باس دەکەین.

دووەم: مەرکەزییەت Centralization:-

مەرکەزییــەت بــە واتای ئاســتی بوونی دەســەڵاتی بڕیــاردان لــە لایەن یــەك کەس یــان یــەك یەکە (کە هەمیشــە لــە کارگێڕی بــاڵا دەبێت)، ئەمەش دەرفەتێــك دەدات بەو کەســەی کە دەســەڵاتی لــە دەســت دایە کە مــافو ســنورێکی بەرفراوان بــە کار بهێنێت لــە بڕیــاردانو هەڵسوکەوتــەکان. هەرچی ئەو کەســانەی کــە لە ئاســتەکانی خوارەوەن ئەم دەســەڵاتەیان نییە لە بەشــداریکردن لە بڕیاردانو هەڵسوکەوت.

لێرەدا مەرکەزییەت وەڵامی ئەو پرسیارە ســەرەکییە دەداتــەوە: لە کــوێ بڕیــارەکان دەردەکرێن؟ هەر بۆیە مەرکەزییەت بریتییە لــە کۆکردنەوەی دەســەڵاتو مافــی بڕیاردان لــە پێگەیەکی ســەرکردایەتی بەرز، ئاســتە نزمەکانــی کارگێــڕی ناتوانێــت هەڵوێســتی هەبێت یــان بڕیار بدات بە بــێ گەڕانەوە بۆ پێگەی سەرکردایەتی باڵا.

ناسینەوەو خەوشەکانی مەرکەزییەت:

مەرکەزییەت کۆمەڵێك ناسینەوەی هەیە کە ڕێکخراوەکان دەتوانن دەســتەبەری بکەن، ئەگەر هاتــوو بیانــوو و بارودۆخێك هەبێت بــۆ بەکارهێنانــی، گرنگترین ناســینەوەکانی مەرکەزییەت ئەمانەن:-

١- کارگێڕی باڵا دەتوانێت هەماهەنگی نێوان یەکە جیاوازەکان بکات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ یەکەکان لە کارگێڕی باڵا کە خاوەن دەسەڵاتێکی گەورەن بــۆ بەکارهێنانی ئەو دەســەڵاتەی کە هەیەتی لە هەڵسان بە هەڵسوکەوتی بە پەلە بۆ بە یەك بەستنەوەی نێوان یەکەکانی ڕێکخستنی، کە ببێتە هۆی گەیشتنی هەماهەنگیو گەیاندن لە نێوان یەکەکان، گەیشــتن بــە ئامانجەکانی ڕێکخراو بە خێرایی، بە بێ هیچ دواکەوتنێك.

٢- کارگێڕی باڵا دەتوانێت کە دەسەڵاتەکان لە دەستی خۆیدا بێتو ئەو کارزانیو زانینانە بەکاربهێنێــت (بــە بێگومــان زیاتــر لەوەی کە لــە کارگێڕی خــواروودا هەیــە) ئەمەش بە مەبەســتی چارەســەرکردنی کێشەکان بە شێوەیەکی وردبین ترو خێراتر.

٣- مەرکەزییــەت یارمەتی دەستخســتنی پلەیەکی بەرز دەدات لە چاودێری ئاســتەکانی خــوارەوە، لە دوایــدا توانای ناســینی هەر لە ڕێ لادانێــك یان دەرچوون لە ئەدای ناســراو، ڕاستکردنەوەی ئەو لە ڕێ لادانە.

٤- مەرکەزییەتی بڕیارەکان لە ئاستەکانی کارگێڕی سەروو زامنی کەمکردنەوەی هەڵەو ترســناکیەکانە، ئەمەش بــە بەراووردکردنی پێدانــی دەرفەت بۆ ئاســتەکانی خواروو هەر کاتێك کە هــەر لە خۆیانــەوە زانیارییەك یا کارزانیەکیان هەبێت.

٥- مەرکەزییــەت جۆرێك لە لەیەکچوونو پابەندبوون بە سیستەمو ڕێنماییو ڕامیاریو یاساو ڕێســاکان دەســتەبەردەکات، ئەوەی کە دەتوانرێــت لــە لایەن ئاســتەکانی خــوارەوە پێشێل بکرێت یان پابەندبن پێوەی.

ئەمەو لە کاتی بەکارهێنانی مەرکەزییەت گەلێــك شــوێنەواری لاوەکــی خراپــی لێدەکەوێتــەوە لــە دەرەنجامــی کۆبونەوەی ســەرجەم دەســەڵاتەکان لــە لایەنێکــی دیاریکراوی باڵاوە، لە گرنگترین خەوشــەکانی مەرکەزیەتیش ئەمانەن:

١- ســەرقاڵ بوونی یەکەکانی کارگێڕی باڵا بــە کارە بچووکەکان بە هــۆی گردبوونەوەی دەسەڵات لە دەســتیان تاوەکو کاری ڕۆتینی یا دووبــارەو ناگرنگیش بێــت، ئەمەش گرنگیو کاتــی بەڕێوەبــەر دەبــات لە کارگێــری باڵاو کاتێکیش کە بەڕێوەبەر سەرقاڵی کارە ناگرنگو بچووکەکانــە کاتی بە دەســتەوە نامێنێت بۆ دەرکردنی بڕیاری گرنگ لە کارەکەی.

٢- بەڕێوەبــەر لــە کارگێــری بــاڵا کــە دەســەڵاتی بــە دەســتە ناتوانێــت گرنگی بە کارە ســتراتیژییەکانی کار بدات وەك گەیشتن بە ئامانجی گشــتی ڕێکخراو جــا چ قازانج یا پێشکەشــکردنی خزمەت بێت بــۆ کۆمەڵگاو کڕیاران.

٣- بەڕێوەبــەر لــە کارگێڕی باڵا ســەرنج ناداتــە ئــەو ڕووداوانەی ژینگــەی کارکردنو دەرفەتێك کە دەبێ بقۆزرێتەوە یان هەڕەشــە کە دەبێت خۆی لێ لابدرێت.

چۆن مەرکەزییــەت لە واقعــی کارکردن سەرهەڵدەدات؟

ئەگــەر مەرکەزییــەت بــە مانــای کۆکردنەوەی دەســەڵات بێت لە کارگێڕی باڵا، هەمــوو کارەکان دەوروخولی قەبــارەو جۆری دەســەڵات دەدەن کە دەکەوێتە لایەنی باڵاوەو لە بنەڕەتیشــدا هەموو ئەو دەســەڵاتانەی کە هەیــە لە لایەنــە دیاریکراوەکانی لە کارگێڕی باڵا، دووبارە دابەش دەکرێتەوە بە ســەر یەکە دیاریکراوەکانی ڕێکخستن.

ئەو ســەرچاوانەی کە دەســەڵاتی زۆریان تێدایە، گرنگترینیان ئەمانەن:-

١- کاروباری دارایی: کە هەڵدەستێت بە دیاریکردنی دەسەڵاتی خەرج کردنی دارایی، واژۆکردن لە سەر چەکەکان، سنووری خەرجکردنی بۆ هەر یەکەیەکی ڕێکخستن.

٢- کاروباری پلانی دارایی: بە دەستنیشانکردنی دەسەڵاتی پلانی دارایی، دابەشکردنی بنەماکانی خەرجکردن.

٣- سەپاندنی سزاکان: هەڵدەستێت بە دەستنیشانکردنی دەسەڵاتی ئەو کەسەی کە دەتوانێت سزا بسەپێنێت، لە هەر بارودۆخێك، لەگەڵ ئەوەی کە چ قەبارەیەکی سزا دەبێت پێشبینی بکرێت.

٤- پاداشت کردن: دیاریکردنی دەسەڵاتی ئەو کەسەی کە پاداشت دەدات، لە چ بارودۆخێکیش، چ قەبارەیەکی کە پێویستە بدرێت بە هاوکاری چ تاکێك دەبێت.

٥- کاروباری کارمەندان: هەڵدەستێت بە دەستنیشانکردنی دەسەڵاتی دامەزراندنو بەرزکردنەوەو هەڵسەنگاندنو هی تر لە ئەنجامدانەکانی داهاتی مرۆیی.

٦- پلان دانان: دیاریکردنی دەسەڵاتی ئەو کەسەی کە هەڵدەستێت بە دیاریکردنی ئامانجو دانانی پلانو پرۆژەکانو پرۆگرامی پلان دانان.

٧- کاروباری کڕین: دیاریکردنی دەسەڵاتی ئەو کەسەی کە هەڵدەستێت بە کڕینو بە چ قەبارەو نرخێکیش.

هاوسەنگی نێوان مەرکەزیەتو لامەرکەزیەت:

زۆر پێداگری کردن لە سەر مەرکەزیەت دەبێتە هۆی خەوشو خراپی کە لە توانستی بەکارهێنانی ئەو مەرکەزیەتە کەم دەکاتەوە، لەسەر بەڕێوەبەران پێویستە کە هاوسەنگی بکەن لە نێوان بە کارهێنانی مەرکەزیەت لە لایەكو لامەرکەزیەت لە لایەکی تری، لێرەوە لامەرکەزیەتمان بۆ بە دیار دەکەوێت کە پێویستە بە دوایدا بچین، بە مانای پێدانی دەسەڵاتی زۆرترو مافی بڕیاردان بۆ ئاستەکانی خوارەوەی ڕێکخستن.

لامەرکەزیەتیش کۆمەڵێك ناسینەوە دەستەبەر دەکات گرنگترینیان:

١- خێرایی زیاتر لە جووڵەو بڕیاردان.

٢- توانای زیاتر لە سەر گونجان لەگەڵ بارودۆخی دەوروبەرو گۆڕانکارییەکانی.

٣- گرنگیدانی زیاترو گەرمو گوری لە لایەن ئاستەکانی خوارەوەو کارمەندەکانی، چونکە بڕیارێك دەردەکەن بە پلەی یەکەم پابەندە پێیانەوە.

٤- کارگێڕی باڵا کاتی زیاتری هەیە تاوەکو گرنگی بدات بە کاری تایبەتی پلاندانانی ستراتیژیو گەیشتن بە ئامانجی ڕێکخراو وەك قازانجو سەقامگیری لە بازاڕو خزمەتی کڕیارو فرۆشیار.

٥- ئاستەکانی کارگێڕی خوارەوە زیاتر هەست دەکەن بە سەربەستیو هەڵسوکەوتو متمانەی زیاتر بە جۆری دیموکراتی کارکردنو ڕەزامەندی پیشەیی.

لێرەدا ئەو شێوازانەی کە بۆ ئەنجامدانی لامەرکەزییەت دەبێت، گرنگترینیان ئەمانەن:-

١- دووبارە دابەشکردنەوەی دەسەڵاتو بەرپرسیارییەتی: لە ڕێگای دووبارەو وەسفکردنی پسپۆرییەکانی ڕێکخستن بۆ یەکەکانی خوارەوەی ڕێکخستن.

٢- پێدانی دەسەڵات: لە ڕێگای مەشق پێکردنی بەڕێوەبەران لە سەر پێدانی بەشێك لە دەسەڵاتیان بۆ ئاستەکانی خوارەوەو هەروەها مەشق پێکردنی کارمەندان لەسەر بە کارهێنانی ئەو دەسەڵاتە.

٣- بەکارهێنانی لیژنەو گروپی کار: کە دەسەڵاتی زیاتر دەدرێت بەم لیژنەو گروپانە لە چارەسەرکردنی کێشەکانو جووڵەکردنیان بە خێراییو لە کاتی گونجاو.

٤- کۆبوونەوەکان: مەشق پێکردنی بەڕێوەبەران لە سەر بەکارهێنانی کۆبوونەوە وەکو شێوازی دیموکراتیو بەشداری کردنی لە بڕیاردان یارمەتیدەرە بۆ هەستکردنی ئاستەکانی خوارەوە بۆ دەسەڵاتی لامەرکەزییەت.

٥- بەهێزکردنی کرێکاران: ئاماژە دەکات بە زۆربوونی تواناو دەسەڵاتی کرێکاران لە ئەداو جووڵە کردنو بڕیاردان.

٦- زانیاری زیاتر: کاتێك کە زانیاری زیاتر دەدرێت بە هەموو ئاستەکانی کارگێڕی، سەبارەت بە پلانی ڕێکخراو و سیاسەتو خشتەو ڕێنماییو یاساکانی کارکردن تا کارمەندان زیاتر هەست بکەن بە کۆنترۆڵ کردنی ئەدای کارەکانیان.

هاوسەنگی نێوان مەرکەزییەتو لامەرکەزییەت متمانە دەکاتە سەر توانای کارگێڕی باڵا لە سەر پشکنینو دیراسەت کردنی فاکتەرە کاریگەرەکان لەسەر ئاستی لامەرکەزییەت کە خۆی لەمانە دەبینێتەوە (توانستو پابەندبوونی کارمەندان، قەبارەی ڕێکخراو، پەرتو بڵاوی جوگرافی، جۆراوجۆری لە بەرهەمو خزمەت، گرنگی داهێنان، خێرایی لە بڕیاردان).

پێوانەکردنی مەرکەزییەتو لامەرکەزییەت:

ئەگەر هاتوو ڕێگات کەوتە ناو یەکەیەکی ڕێکخستن ئەوا دەتوانی ئەو هێمایانە بدۆزیتەوە کە ڕێنمایت دەکات بۆ مەرکەزییەتو لامەرکەزیەت! لێرەدا دەتوانین دەست نیشانی ئەم خاڵانە بکەین لە سەر ئاستی مەرکەزییەت وەکو:

* ئاستی بەشداری کردن لە بڕیاردان.
* ئاستی پێدانی دەسەڵات.
* ئاستی بڕیاردانو بەشداری کردنی کارمەندان.
* ئاستی بەکارهێنانی لیژنەو کۆبوونەوەکان.

تاوەکو ئاستی بەشداریکردن لە بڕیاردان دابەزێت، ئاستی پێدانی دەسەڵاتیش دادەبەزێت، ئاستی بەشداریکردنو بەکارهێنانی لیژنەو کۆبوونەوەکان دادەبەزێت، ئەمەش هێمایەکە بۆ بوونی بەرزبوونەوەی ئاستی مەرکەزییەت لە دەسەڵاتی بڕیاردان.



# دیاردەکانی جێهێشتنی کارگێڕی

بەشی سێیەم

م.هاژە شێروانی

پێنجەم/ گیروگرفتی هونەری/ بوونی گرفتی هونەری لە کارگێڕی لەم چەند خاڵەدا خۆی دەبینێتەوە:

١- نەبوونی راهێنان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی توانای فەرمانبەر.

٢- نەبوونی ئامێرو کەل‌و پەلی پێویست.

لێرەدا دەتوانین هۆکارەکانی جێهێشتنی کارگێڕی لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

١- نەبوونی چاودێری خود.

٢- لاوازیی راهێنان‌و پەرەپێدان.

٣- لەبەر چاو نەگرتنی پسپۆری لە دامەزراندن لە سەر بنەمای توانست‌و پابەند بوون.

٤- نەگونجانی مووچە لەگەڵ ئاستی بژێوی‌و نە بەستنەوەی بە ئاستی نرخەکانی جیهان.

٥- لاوازی چاودێری کۆمەڵایەتی یا هەر نەبوونی.

٦- نەبوونی پلانی ساڵانە بۆ چاکسازی کارگێڕی لە نێو هەموو یەکە کارگێڕییەکان.

٧- کەمتەرخەمی هەماهەنگی لە پێناو یەکخستنی کۆشش لە ماوەی قۆناغەکانی کارگێڕی بە مەبەستی رێکخستنی کۆششی کۆمەڵ‌و قەدەغەکردنی دروست بوونی هەستیاری لە نێوان فەرمانبەران.

٨- کەم نەکردنەوەی (اجراءات)ی کارگێڕی.

٩- دیاردەی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لە دژی فەرمانبەران.

١٠- زۆربوونی رکابەری لە نێوان فەرمانبەران لە هەندێك یەکەی کارگێڕی.

١١- خراپ دابەشکردنی کارمەندان‌و بەکارنەهێنانی تەواوەتی کە هۆکارێکە بۆ دروست بوونی بێکاری داپۆشراو (البطالة المقنعة).

★ شوێنەواری جێهێشتنی کارگێڕی:

لێرەدا گەلێك شوێنەوار هەن کە لە ئەنجامی بەردەوام بوونی فەرمانبەر بە جێهێشتنی کارەکەی بەدیار دەکەون، جا چ لە سەر ئاستی کارگێڕی گشتی بێت یا لە سەر ئاستی فەرمانگەکەی، بە گشتی دیاردەو شێوازی جێهێشتنەکەی دەگۆرێت وەك نەهاتنی فەرمانبەر بۆ شوێنی کارەکەی، یا هاتنی بەڵام خەریك بوونی بە گاڵتەوگەپکردن لەگەڵ هاوەڵەکانی، جێهێشتنی نوسینگەکەی شوێنەواری سلبی لێ دەکەوێتەوە لە زۆر لایەنی وەك:-

یەکەم/ شوێنەواری ئابووری: دەبینین لە دەرەنجامی جێهێشتنی کار کۆمەڵێك شوێنەواری سلبی دەبێت کە بریتین لە:-

١- بەرزبوونەوەی تێچوونی خزمەت‌و بارگرانی دروست کردن لە سەر بوودجەی کۆمپانیا یا فەرمانگە بە تێچوونێك بە بێ ئەوەی کە هیچ بەرهەم‌و خزمەتێکی پێش کەش کردبێت.

٢- بە فیرۆدانی کات لە ئەنجامی چەند جار دووبارە بوونەوەی سەردانی هاوڵاتی بۆ شوێنی مەبەست‌و رانەپەراندنی کارەکەی لە کاتی خۆیدا.

٣- نەتوانینی کۆمپانیا بۆ جێبەجێکردنی پلانی دارێژراو لەوادەی دیاریکراوی خۆی کە هۆکارەکەی دەگەرێتەوە بۆ کەمتەرخەمی کارگێڕی.

٤- لە بەرچاو نەگرتنی بەرژەوەندی گشتی‌و نەپاراستن یا خراپ بە کارهێنانی کەل‌وپەلی فەرمانگە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی‌و فەرامۆش کردنی دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە باری ئابووری.

٥- کارنەکردن بە گوێرەی ئەو یاساو رێسایانەی کە فەرمانبەر بۆی دارێژراوە لە کارو لە ئەنجامیدا دەبێتە هۆی دروست بوونی فەوزایەك لە خزمەتکردن‌و لە دەرەنجامدا دیاردەی خراپی لێدەکەوێتەوە.

دووەم/ شوێنەواری کۆمەڵایەتی:

١- بەردەوامی کۆنترۆڵکردنی یەك کەس لە سەر تاك‌و کۆمەڵگا، ئەگەر هاتوو فەرمانبەر کارەکەی لە رێگای‌واستە کردنەوە دەست کەوتبوو لە رێگای هاوەڵ یا خزمەکانی (دەبینین کە بەرزکردنەوەو بەردەوامی لە کارەکەی لە سەر هەمان بنەما دەبێت).

٢- نایەکسانی دەرفەت لە نێوان هاوڵاتیان بە دەستخستنی خزمەتگوزاری پێویست‌و درەنگ کەوتنی‌وەرگرتنی دەبێتە هۆی بەربلاوی دیاردەی رەشوەو واسیتە کردن‌و پەنا بردنە بەر کۆمەڵێك دیاردە بۆ دەست خستنیان.

سێیەم/ شوێنەواری کارگێڕی:

دانەنانی کەسی شیاو لە شوێنی شیاو، تا شێوازەکانی هەڵبژاردن‌و دەستنیشان کردن‌و دامەزراندنی فەرمانبەر بە گوێرەی پسپۆری‌و بنەمای زانستی‌و ورد بێت لەگەڵ لەبەر چاو گرتنی ئاستی لێهاتوویی‌و کارزانی ئەو تاکە، کارگێری ئەو فەرمانگەیە بە دوور دەبێت لە دواخستن‌و رانەپەراندنی کاری هاوڵاتیان لەوادەی دیاریکراو.

دەرەنجام‌و چارەسەری:

لێرەدا پێویستە کە کارگێڕی کاروباری





فەرمانبەران بەم کارانەی خوارەوە هەڵبستێت:-

١- سەرپەرشتی دانانی پلانو پرۆگرامی پێویستو جێبەجێکردنی بڕیارو راسپاردەکانی ئەنجومەن.

٢- کارکردن بۆ کورتکردنەوەی شێوازو ڕێگاکانی کار سەرەرای هەماهەنگیو دابەشکردنی کار لەنێوان هەموو بەشەکان.

٣- دەستنیشان کردنی پێویستی فەرمانگە بە هێزی کارو سەرپەرشتیکردنی لێکۆڵینەوەو دیراسەتی تایبەت بە وشیاری کارگێریو پەرەپێدانی هێزی کارو دانانی پرۆگرامی راهێنان.

٤- سەرپەرشتی هەموو کاروبارە داراییەکان لە مووچەو بەرزکردنەوەیو... هتد.

٥- سەرپەرشتی کارەکانی پۆستە لە دەرکردەو وەرگرتەی هەر نوسراوێکی فەرمیو تۆمار کردنیان لە تۆماری تایبەت.

٦- دانانی راپۆرتی تایبەت بە کاروباری فەرمانبەران ماوە ماوە.

٧- سەرپەرشتی کارەکانی کڕینو چاککردنەوەو ئەنجامدانیان لە ڕێگای (بەشو یەکەکانی تایبەت بە کاروباری فەرمانبەرانو راهێنان، پەیوەندیو کاروباری گشتی، کڕینو گەنجینە، بەشی داراییو ژمێریاری).

گرنگترین چارەسەری ئەم دیاردەیەش لەم چەند خاڵەی خوارەوە خۆی دەبینێتەوە:-

١- لە سەر فەرمانبەر پێویستە کە ئەو کارە کە لە سەریەتی بە چاکیو ڕێكوپێکیو بە وردیو دەست پاکیو ئەمانەتەوە رایبپەڕێنێت.

٢- تەرخان کردنی کاتی دەوامی فەرمی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی لە سەریەتی.

٣- بە گوێرەی ئەو یاساو ڕێساو سیستەمانەی بۆی داڕێژراوە لە کار، کاریان لە سەر بکات.

٤- هاوکاریو هەماهەنگی لەگەڵ هاوەڵانی ژوورەکەیو یەکەکانی تری فەرمانگەی کار ئاسانی دروست دەکات لە ڕایی کردنی مامەڵەی هاوڵاتیان.

٥- فەراموش نەکردنو دوانەختنی ئەرکەکانی رۆژ بە رۆژو لە وادەی دیاریکراوی خۆیدا.

لە کۆتاییدا ئەوەندە دەڵێم کە پێویستە لە سەر ئێمەی تاکی کوردیش کە دڵسۆزانە ترو کارامە تر ئەو کارانە رابپەڕێنین کە لە سەر شانمانە، چونکە پێشکەوتنی وڵاتەکەمان بەندە بە هەست کردنمان بە بەرپرسیارییەتی بەرامبەر هاوڵاتیانو حکومەتو لە کۆتاییدا ئاستی پێشکەوتنو پەرەپێدان بەرەو ئەو ئاراستەیە دەبەین کە وڵاتانی پێشکەتوو پێی گەیشتوون.

# ڕێگرێک لەبەردەم پێشکەوتندا

و/ درخشان بهاالدين محمد

بەیانییەك کاتێك کارمەندەکان گەیشتنە بەڕێوەبەرایەتییەکەیان، تابلۆی ئاگادارییەکانیان بینی، ئاگادارییەکی گەورەی لەسەر نوسرابوو: «دوێنێ ئەو کەسەی کە هەمیشە لە بەڕێوەبەرایەتییەکە ڕێگر بوو لە بەردەم لە پێش چوونی تۆ ماڵئاوایی لەژیان کرد! ڕێورەسمی بەخاك سپاردنی سبەی کاتژمێر «١٠» ی سەرلەبەیانی لە هۆڵی کۆبوونەوەکان بەڕێوە دەچێت».

لە تەواوی بەڕێوەبەرایەتییەکە باس باسی ئەو ئاگادارییە سەیرو سەمەرەیە بوو! هەمووان لە بیستنی هەواڵی مردنی هاوکارێکیان نارەحەت بوون، بەڵام لەهەمان کاتدا حەزیان دەکرد بزانن کەسێ ڕێگربووە لەبەرەو پێشچوونی ئەوان چ کەسێ بووە.

سبەی بەیانییەکەی هەموو کارمەندەکان کاتژمێر «١٠» چوون بۆ هۆڵی کۆبوونەوەکان، کەم کەم ئامادەبووان زیادبوونو دەنگی چپە چپ هۆڵەکەی داگرت، هەموو بەیەکدییان دەوت: ئەو کەسە کێ بووە کە ڕێگر بووە لەبەردەم بەرەو پێشچوونی ئێمە لە بەڕێوەبەرایەتییەکە؟ باشتر کە مرد! لە هەمان کاتدا کۆمەڵێ بیری تازەو جۆراوجۆر بۆ سەرکەوتنی خۆیانو ئەوکارانەی کە نەیان کردووە بەمێشکیان دا دەهاتو خۆشحاڵ تر دەبوون.

گشت کارمەندەکان لە ریزێکدا ئامادەبوون تا یەك یەك بۆ ڕێزنواندن بڕۆنە لای تابووتەکە بەڵام کە دەچوونو سەیری ناو تابوتەکەیان دەکرد لەپڕ سەرسام دەبوونو قسەیان بۆ نەدەکرا!

لەناو تابوتەکەدا ئاوێنەیەك دانرابوو، کە هەرکەس سەیری ناو تابوتەکەی دەکرد وێنەی خۆی دەبینی، نوسراوێکیش بە تابووتەکەوە هەڵواسرابوو تێیدا نووسرابوو: «تەنها کەسێك کە دەتوانێت ڕێگربێت لەبەردەم گەشەو پێشکەوتنی تۆ کەسێك نییە جگە لەخودی خۆت، تۆ تەنها کەسێکی کە دەتوانیت ژیانت بگۆڕیتو یارمەتی خۆت بدەیت، ژیانی تۆ بەگۆڕینی بەرپرسو دۆست، دایكوباوك، هاوسەری ژیان یان شوێنی کارکردنت چاك نابێت، ژیانی تۆ تەنها کاتێ دەگۆڕێت کە تۆ بیرو باوەڕە نادروستو دیاریکراوەکانی خۆت بنێیتە لاوە». سەرچاوە: گ-موفقیت - ژ.١٥٢.

# سەرۆك و كارمەندان لە كاردا

ئاوات جمال

سەرۆكی كار:

چۆن وادەكەیت كارمەندەكانت گرۆتینیان بەرز بێت؟

لێرەدا مەبەستم لە فشار خستنە سەر كارمەندەكانت نییە، بەڵكو پێویستە وایان لێ بكەیت هەمیشە چوستو چالاك بنو بەردەوام لە جێبەجێكردنی كارەكانیان دابن، لە هەمان كاتدا چۆن پێ داگربیت لە سەریان.

جا گەر تۆ خاوەن كاربووی چی دەكەی لەگەڵ فەرمانبەرەكانت؟ چ ڕێگەیەك دەگریتەبەر بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی ئەنجامدانی باشترین كاری كارگوزارەكانت تا بگەیتە بەدەست هێنانی بەرزترین پلەی سەركەوتن؟

گەر بۆ ساتێكیش بێت بیهێنە خەیاڵی خۆت كە تۆ ئیمپراتۆری كاریت، جا ئەو یاسا راستانە كامانەن كە دەیان گریتە بەر تا ئەو ئیمپراتۆریەتەی پێ بەڕێوە بەریت؟

چاوت بنوقێنەو ئەم ئیمپراتۆریەتە لە خەیاڵتدا دابنێ، ئایا چەمكێكی دیاریكراو هەیە بۆ سەركەوتنی زیاتر؟

ئەمەش ڕێوشوێنو بنەمای ئەم ئیمپراتۆریەتەیە:

هەڵبژاردنی ڕاستەقینە بۆ هەر یەكێك لە

سەرۆكو كارمەندەكان:

هەستكردن بە بەختیاری لەكاردا سەرچاوە دەگرێ لە هەڵبژاردنی ڕاست بۆ هەریەكێ لەسەرۆكو دەستو پێوەندەكان، ئەو سیفەتانەی كە دەبێت لە دەستو پێوەندەكاندا هەبێت:

- توانای فێربوون.
- ئامادەیی بۆ فێركردنی كەسانی تر.
- توانای پاراستنی شوێنكاری هەبێت كە كاری تیا ئەنجام دەدا، بەباشیش لێوەی بدوێ.
- خاوەنی ڕوویەكی خۆشو ڕێكوپێك بێت.
- توانای چارەسەركردنی ئەو كێشانەی هەبێت كە ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

گرنگی بەختیاری.....

- خۆت بە گەورە مەزانە: چۆن هەڵسوكەوت دەكەیت گەر زوو چوویتە سەركارو بینیت ئامێرێكی كۆمپیوتەر دیار نییە كە كۆمپانیاكە هەیەتی، ئایا پۆلیسی لێ ئاگادار دەكەیت تا ئەویش بە ڕۆڵی خۆی هەڵسێت لە لێكۆڵینەوە؟ پرسیارو وەڵام ئاراستەی فەرمانبەران دەكەیت تا پەنجەی تاوان بخەنە سەر كەسێكی دیاریكراو؟
- یان گریمان دوای ئەوەی چوویتە سەر كارەكەت یەكێك لە فەرمانبەرەكانت دەست لەكار كێشانەوەی خۆی پێشكەش كردی.... چی دەكەیت؟

ئایا دەتوانی فەرمانبەرێكی تر دابمەزرێنیت، بەڵام ئەمە زۆرتر دەكەوێت لەسەرت لە جیاتی نرخی پارەی ئەو كۆمپیوتەرەی كە بزر بووە.... بەڵام لەم جارەدا ناتوانی هیچ ڕێو شوێنێكی لێكۆڵینەوە بگریتە بەر....!!

كار واناكرێ لەبەرئەوە لوت بەرز مەبە لە هەڵسو كەوتتدا لەئاست فەرمانبەرەكانتدا، ڕێیان پێ بدە كە هەست بە دڵنیایی بكەنو كە تۆ كارت بەوانە، وامامەڵەیان لەگەڵدا بكە كە ئەوان سەرچاوەیەكن ناتوانی بێ ئەوان هەڵكەی، هەروا بە ئاسانی ناتوانی دەست بەرداریان بیت.

- تۆ فرۆشیار بە:

فەرمانبەرەكانت مەفرۆشە، بەڵكو تۆ تەنها كاڵاكانت دەفرۆشی ئەمەش كاری تۆیە هەمیشە وا دەروانن كە یەكێك دێت بۆ بەدەست هێنانی كارێك لای تۆ بۆ فەرمانێك ئەو بە فرۆشیار بزانیو كۆمپانیاكەش بە كریار كە كۆمپانیایەك لە ڕێگای ئاگاداركردنەوەی خۆیەوە هەڵدەسێت بە ئاشكراكردنی

پێداویستییەکانی وەك فەرمانێك لەم کاتەدا (فرۆشیار) (پێشکەشکار) لێهاتووەکانی خۆی دەخاتە روو لەلایەن ئەو کۆمپانیایەوە کە هەڵدەسێت بە دەوری (کریار)، ئەم بیروبۆچوونانە بگۆرە، جا پێویستە ئاڵوگۆر بکرێ (پێچەوانەی دەورەکان) لەبری ئەوەی هاورێکانت لەدەست بدەی یان بچن بۆ لایان.

- مامەڵەی خراپ لەگەڵ فەرمانبەران مەکە:

جۆری مامەڵەکردنت لەگەڵ فەرمانبەراندا بەشێوازێکی رێكوپێك بێت، بەشێوەیەك بگونجێ لەگەڵ سەرەتایی ترین ئەو شتانەی کەپێویستە کارەکانی پێ بەرێوە دەچێ. مامەڵەی باش فەرمانبەرانت بەختیار دەکات ئەویش رەنگ دەداتەوە لەگەڵ کریارەکاندا کە کلیلی سوودو قازانجی هەر دامەزراوەیەکە.

- گوێ لەفەرمانبەران بگرە:

رێگە بدە بە هەر فەرمانبەرێك کە دەربارەی کێشەکانی لەکارەکەیدا هەیەتی باقسە بکات، بواریشی پێ بدە بۆ دۆزینەوەی رێگاچارەی کێشەکان. دیکتاتۆری مەنوێنە لەدەرکردنی بریارەکانتدا بەبێ موناقەشە.

گەر لای ئەو فەرمانبەرە رێگەچارەشی لا نەبوو، ئەوا لەئەنجامدا کارکردنێکی زۆر بۆ ماوەیەکی درێژ شارەزاییەکی چاکی لادروست دەبێت لە کارەکەیدا.

بۆ زیاتر چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ سەرۆکی کارێکی قورس:

- دوای بنەمای ئالتونی مەکەوە:

ئەم بنەمایە هەروەکو لەمناڵییەوە فێری بووین (بەوشێوەیەی ئەوان مامەڵەمان لەگەڵدا دەکەن ئێمەش بەهەمان شێوەی ئەوان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین) بەگرتنەبەرمان بۆئەم بنەمایە وەك ئەوە وایە گریمان ئەوان چیان دەوێ ئێمەش ئەوەمان بوێت، بەڵام ئەمە راست نییە لەزۆر کاتدا، سەرەتا با پرسیاریان لێ بکەین لەوەی کەدەیانەوێ پاشان هەوڵدەین جێ بەجێی بکەین.

- وایان لێ بکە هەست بە لێپرسراوێتی بکەن:

فەرمانبەران جیاوازن، هەندێکیان وا کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن کە لەناخیان دا هەستێکی لێپرسراویان تێدایە، بە بێ گەرانەوەی بۆ خاوەن کار، بەڵکو کاری زۆرو زۆرتر دەکەن بە بێ دەرکردنی رێنمایی بۆیان، بۆ ئەم جۆرانە سەربەستییان پێ بدەو با بە ئارەزووی خۆیان کارەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن، چونکە سەرکەوتنی خۆیانو کارەکەی تۆشی تێدایە.

- پێداگرتنەوە لە کریارەکان:

ئەمە هەمیشە ئەو دەستەواژەیە دەگەیەنێت « کریار هەمیشە لەسەر حەقە»، چونکە تۆ دڵی کریار رازی دەکەیت مانای وایە رێژەی کرین بەرزدەکەیتەوەو لە ئەنجامدا سەرکەوتنی کارەکەتە. ئەمجارەیان عەمیلی تۆ (فەرمانبەر)ەکەتە.

جا هەرچەندە فەرمانبەرەکەت بەختیار بێت ئەوەندەش رازییە، بەم شێوەیە کار زیاتر دەکرێ.

کەواتە تۆ رێکخەری کاری دەبێت نەخشەو پلانی وادابنێی وەك پۆشاکێ چۆن بسازێ بەهێندەی پێداویستییەکانیان، لەهەمان کاتدا جۆرە رووبەروووبوونەوەیەك بخولقێنی کە ناچاربن بەدەمتەوە بێن، لە هەمان کاتدا بایەخدان بە پلە جیاوازەکان، دابینکردنی سەربەخۆییان... هتد.

دانانی نەخشەی کارکردن:

گۆرەپانی کارکردن وەك (پێشبرکێی ماراسۆن) وایە، ئەگەر خۆت پێش وەخت چاك ئامادە نەکردبێت ئەوا زەرەرمەندیت لە ئەنجامدا مسۆگەرە، بۆیە پێویستە بەرنامەرێژیو ئەنجامەکانی کار دیاری بکرێن.

هەروەها هەڵسەنگاندنی ئەو بەرنامەیە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر تا بزانی تا چ ئاستێك فەرمانبەرەکانت پێوەی پابەندن، بەپێی ئەو داتاو زانیاریانەی کە لەلات دەست دەکەوێت یان هەیە، چ بەدەمی یان نووسراوی فەرمی یان نافەرمی.

- ئاستی لێپرسراوی دیاری بکە:

لەگەڵ بوونی ئازادی بۆ هەریەکێ لەفەرمانبەران لە ئاست ئەو بریارانەی کە دەردەچێت بۆیان بەڵام لەهەمان کاتیش دا ئەو لێپرسراوێتییە سنووردارە، جا بریارێکی تایبەت بە کارە گەورەکان، کە کاریگەری بە شێوەیەکی بەرچاو دەبێت لەم بوارەدا جڵەوی کارو فەرمان بەدەست بەرێوەبەر یان خاوەن کاربێت، راستە فەرمانبەر ئازادی هەیە لە سنوری کارەکەیدا ئەو پەری رای خۆی هەیە بە رەهایی لەسەر دەرکردنی بریاردا، بەڵام ئەم جۆرە ئازادیەش پلەبەندە.

- با فەرمانبەران هەست بە بایەخیان بکەن:

هەمیشە خاوەن کارەکان لەم خاڵەدا رادەکەنو لێی نزیك ناکەونەوە بەشوێنێکی تاپۆی دەزانن و قسەی لەسەر ناکەن، باشە بۆچی واناکەی کە فەرمانبەرەکانت وا هەست بکەن کە ئەوان جێگەی بایەخی تۆن؟ هەرگیز خۆت وا دامەنێ کە تۆ ناتوانی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە، یان توانات نییە بەسەریدا، کە ئەو فەرمانبەرانە جێگەی رێزو گرنگی تۆن.

کارێکی وابکە تەنانەت با فەرمانبەرەکان بتوانن وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە.

- هەوڵ بدە هاوکێشە قورسەکە بەجێ بێنی:

وزە = دیاریکردنی گرنگی پاداشتو خەڵات لە کاتی بەئەنجام گەیاندنی کارێك وەك هاندانێکی مەعنەوی.

جا کارگێری هونەرو زانستە، پێویستە بەخشندە بیت لەگەڵ فەرمانبەرانت.

- لەکاتی پێویست دا وزەیان بکەرەوە بە بەردا:

چ فەرمانبەر یان کرێکار لە هەر بوارێکی کارەکاندا هەر وەکو پاتری وان، لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر پێویستیان بە شەحن کردنەوە هەیە، چونکە ئەوانیش دووچاری بێ تاقەتیو بێزاریو هیلاکی دەبن لە ئەنجامی رۆیشتنی ژیانی رۆژانەوە، جابۆ بەتاڵ کردنەوەی ئەوناڕەحەتیەیان پێویستیان بەشەحن کردنەوەی ئیجابی هەیە بە بەردەوامی... بەرێوشوێنە زیرەکانت.... هەمیشە هەوڵ بدە ورەیان بەرز بێ!!

- دابین کردنی ئارامی:

هەندێ ئیمتیازاتی کۆمەڵایەتی بدە بەکارمەندەکانت، وەك دانانی سندوقێك بۆ پێشکەشکردنی یارمەتیو کۆمەك بۆ یان بە تایبەتی لە کاتی ژن هێنانو مردنو لەدایك بوونو... هتد، سەرەرای پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ خۆیانو خێزانیان لە بواری پەروەردەو تەندروستییەوە.

- گەشەکردنی گیانی خێزانی:

ئەوەی کە رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە هەمووکۆمپانیاو دامەزراوەکەیدا ئەوەیە کە پەیوەندی نێوان تاکەکانی ئەو کارمەندانە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بۆ گەشەکردنی پەیوەندییەکی رۆحی لە نێوانیاندا، ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە: ئاهەنگ گێران- رێکخستنی سەیرانوگەشتوگوزار- ئاهەنگ گێران بە بۆنەی جیاجیاوە وەك جەژنەکان.... هتد.

- پەیوەندی سەرۆك بە دەستو پێوەندەکانیەوە:

دەبێ پەیوەندییەکی هەمیشەییو بەردەوام هەبێ لە نێوان سەرۆكو کارمەندەکانیدا، ئەوەی زیاتر ئەم ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆ لێی بەرپرسیارە ئەویش خاوەنی کار یان بەرێوبەرە لە رێگای پتەوکردنی پەیوەندی نێوان فەرمانبەراندا پشتگیریان لەهەموو هەواڵێکدا کە پێی دەگا لەبارەی رووبەروو بوونەوەی کۆمپانیاکە چ لە سوود یان قازانج دا، دەبێ ئاگاداریان بکاتەوە لەو کارانەی ئەنجامیان داوە بەرامبەرکەسانی تر.

و: هەڵمەت فوئاد

# ویستی کۆنترۆڵ کردنت چەندە؟



بۆئەوەی بزانیت ویستی کۆنترۆڵ کردنت بــۆ ڕووداوەکانــی دەوروبەرت لــە چ پلەیەك دایە. بۆردی عەرەبی بـــۆ کارامەیی فێرکردن هەڵساوە بــە داڕشــتنی چەنــد پرســیارێك پاڵپشـت بە بنەما زانسـتییەکان لــە بواری پەیوەندییە مرۆڤایەتیـەکان، تۆش بفەرموو بــە تاقیکردنــەوەی خۆت بۆ ئــەوەی بزانیت تاچەندە ڕات لە ڕادەی ویستی کۆنترۆڵ کردنت هەیە، سەرەتا پرسیارەکان بە وردی بخوێنەوەو بۆ وەڵامی هەر پرسیارێك:

| | | |
|---|---|---|
| بەڵێ ژمارە (٢) دابنێ | نەخێر – ژمارە (١) دابنێ | نازانم – ژمارە (٠) دابنێ |

١- ئایا زوو تورە دەبیت؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

٢- ئایا ئەوە دەردەبڕیت کە لە ناختدایە؟ ئەگەر چـی دەربڕینی ببێتە هۆی تورەکردنی ئەوانی تر؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

٣- حەزدەکەیت خەڵکی نارەحەت (احراج) بکەیت؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

٤- لەکاتــی ســەیرکردنی بەرنامەیەکـی تەلەفزیۆنــی پێــت وایــە تــۆ باشــتر لــە پێشکەشکارەکە دەتوانی پێشکەشی بکەیت؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

٥- حەزدەکەیت سەرپەرشتی ڕێو ڕەسمو بۆنە کۆمەڵایەتییەکان بکەیت؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

٦- ئایا ڕقت لە نەریتو ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان دەبێتەوە؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

٧- ئایا ڕقت لە بیروبۆچونی کەسانی تر دەبێتەوە؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

٨- ئایا پێت خۆشە کاروبار تەنها بەو شێوەیە بێت کە تۆ دەتەوێت؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

٩- ئایا لە کاتی گفتوگۆکردندا وشەی زبر بەکار دێنیت؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

١٠- ئایا پارەوپولت لەو پرۆژەیە بەکاردەبەی کە پشکەکانی قازانجی خێرایان هەیە؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

١١- ئایا ئاماژەو نیشانەکانی ڕێنمایی هاتوچۆ پشت گوێ دەخەیت؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

١٢- کاتێك کە پێشرەوی ڕێگەیەك دەکەیت گرفت دەوروژێنی لەبەردەم ئەم ڕێگەیەدا؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

١٣- ئــەو بیروڕایانــەی کــە پێچەوانــەی بیروڕای تۆن تورەت دەکەن؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

١٥- پێت وایە ڕەگــەزی خۆت زیرەکترە لە ڕەگەزی بەرامبەر؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

١٦- پێــت وایــە تۆ زیرەکتری لە کەسانی تر؟

☐ بەڵێ ☐ نازانم ☐ نەخێر

ئێستاش ئەو ژمارانە کۆبکەرەوە کە بە دەستت هێناوە؟

| | |
|---|---|
| (٠- ٤) | کەسێکی هێمنو لە سەرخۆیت. |
| (٥- ٨) | کەسێکیت بە ڕوانینێکی ئاسانو دوور لە بە کێشە کردن دەڕوانیتە ڕووداوەکان. |
| (٩-١٢) | کەسێکی بێ خەمو پەژارەیت. |
| (١٣-١٧) | ویستی کۆنترۆڵکردنت لە پلەیەکی مام ناوەند دایە. |
| (١٨-٢١) | ویستی کۆنترۆڵکردنت لە سەرووی ناوەندە. |
| (٢٢-٢٥) | ویستی کۆنترۆڵکردن بۆتە خولیات. |
| (٢٦-٣٠) | بە ڕادەیەکی زۆر خولیایی ویستی کۆنترۆڵکردنت هەیە. |

سەرچاوە/ البورد العربی لمهارات التعلیم



# باشترین شێوازی کارگێڕی

ئا/ عومەر عەبدولقادر

زۆر ڕێنمایی‌و ئامۆژگاری هەن بۆ ئەو بەڕێوەبەرانەی کە کۆشش دەکەن تا کارەکانیان بە باشترین شێوە ئەنجام بدەن.. لێرەدا باسی (١٠) تەکنیکی کارگێری دەکەین کە بەڕێوەبەر والێدەکەن زیاترخۆڕاگربێت لە بەرامبەر گۆرانکارییەکاندا، سەرەڕای ئەوەی کە هیچ ڕۆچوونێك لەم تەکنیکانەدا نییە، تەنها ئەوە نەبێت کە بەڕێوەبەرانی سەرکەوتوو لەوانی دی جیادەکاتەوە.

١- بەشێوەیەکی سروشتی هەڵسوکەوت بکە:

با هەوڵەکانت ببنە شتێکی دەگمەن‌و ناوازەو سەرکەوتووت بکەن.. بێگومان هەندێ شێوازی کارگێری باشترن لە هەندێکی تریان، زۆربەمان لاسایی کەرەوەیەکی خراپین تەنانەت ئەگەر هەوڵیش بدەیت لاسایی باشترین بکەیتەوە پێویستە دەرك بەوە بکەیت کە ئەوە بۆ ئێمە تەنها چاولێکەرییە، ئەمەش ئەوە ناگۆڕێت کە ئەو هەڵسوکەوت‌و ڕەفتارانە هەڵدەبژێریت‌و چاویان لێدەکەیت کەبۆ تۆ گونجاون‌و زیاتر ئاسودەت دەکەن.

٢-وردبینبە لە دۆزینەوەی خاڵە بەهێزەکانت:

هەموو خەڵکی خاڵی لاوازیان هەیەو بێگومان پێویستە لەسەرمان کە هەوڵبدەین بۆ نەهێشتن‌و سرینەوەیان، گۆرانکاریکردن ئارامگری‌و پشوودرێژییە تەنها بە لەسەرخۆیی‌و هێمنی‌و بەکۆششی گەورە بەدیدێت.

٣- کەسانی تر بەکاربهێنە:

مرۆڤی نائاسایی نابێتە پێشەنگێکی کارگێری باش‌و سەرکەوتوو.. ئەو کاروبارانەی کە دەبێت بەشێوەیەکی باش ئەنجام بدرێن بسپێرە بە کارمەندە بەهرەدارو لێهاتووەکان‌و گوێڕادێربە بۆ تێبینی‌و ئامۆژگاریەکانیان یان هاوکاری لە دۆست‌و هاورێیان وەرگرە ئەگەر حەزت کرد کەسانی تر بەشداریت بکەن، ئەوەش بەشێوەیەك جێی سەرسورمانە کە بەئاسانی کەسانی تر والێبکەیت بەرپرسیارێتی لە ئەستۆ بگرن.

٤- باشترین کەس دابمەزرێنە:

هەروا بەئاسانی جێگرەوەیەك نییە بۆ کەسانی بەهرەدارو لێهاتوو.. بە لەبەرچاوگرتنی توانای کارگێرییان ئەوە خاوەن داهێنان‌و بەهرەدارانن کە زیاتر بەرهەم دەهێنن لەو کەسانەی کە خاوەنی کارامەیی‌و لێهاتووییەکی کەمن، لە کۆتاییدا «ئەوە سەرچاوەی مرۆیی دامەزراوەکەیە کە ئاستی بەجێهێنان (الاداء) دیاریدەکات».

٥- سنورێك بۆ بەرنامەکانت دابنێ:

هەمیشە کۆمەڵێك کاروباری گرنگ‌و زۆر هەن کە پێویستە ئەنجامیان بدەیت، بەڵام ڕێژەی دەرامەتەکانی دامەزراوەکەت تا ئەندازەیەکە، زۆرجار توانای کارمەندەکانت کەمترە لەوەی کە بتوانن کاروبارەکان بەباشی ئەنجام بدەن. بۆیە هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی چەند کاروبارێك لەیەك کاتدا وادەکات کە کاروچالاکییەك ببێتە هۆی پەکخستنی کاروچالاکییەکی تر، لە کۆتاییدا هیچ کارێك بەشێوەیەکی باش ئەنجام نادرێت.

٦- بە باشی بزانە دەتەوێت چی بەدیبهێنیت؟

لە نەبوونی ئامانجێکی ڕوون‌و ئاشکرادا ڕێنمایی‌و ئەرکەکان دەبنە کارێکی لێڵ‌و ناتەواوو سەرەتاو دەروازە هەڵەکان‌و کۆتاییە داخراوەکانیش دەبنە کارێکی سروشتی، هەربۆیە لەمەوە پێشبینی دەکرێت کە لەبەرامبەر کارکردنێکی زۆردا دەرەنجامێکی کەم بەدەست بهێنرێت. ئیتر لێرەوە تەنانەت بەپەیرەوکردنی کەسانی لێوەشاوەو بەهرەداریش ناتوانیت بیرۆکەو ئەندێشەکانت بخوێنیتەوە.

٧- لەنزیك کارەکەت بمێنەرەوە:

ڕاپۆرتی چۆنێتی ئەنجامدانی کارو بەدیهێنانی بەشێوەیەکی بەرنامەرێژ دیاردەیەکی دەگمەنە.. بەشوێن ئەنجامدانی کارەکاندا برۆ تا دڵنیابێت لەوەی کە فەرمانبەران بە باشی لە ڕێنمایی‌و داخوازییەکانت تێگەیشتوون، هەروەها لە ڕێڕەوی بەرێوەچوونی کارەکەوە هەستکردن بەپێویستی گرتنەبەری ڕێوشوێنی چاککاری‌و گۆرانکاری دەردەکەوێت.

٨- هاوکاری خەڵکی بکە لە بەجێهێنانی کارەکانیاندا:

چەند دەتوانیت بە هەوڵ‌و کۆششەکانت بەشداری بکە لە ئاسانکردنی کاروباری خەڵکیدا، جا ئەمەش لە میانەی بەدەستخستنی دەرامەتی زیادەدا بێت یان چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانیاندا بێت یاخود بەدەربرینی گوزارشێکی هاندەرانە بێت.. هەر دەربرینێکی ئەرێنی (ایجابی) لەسەر ئەو کارەی کە فەرمانبەرێك بەشێوەیەکی جیاواز ئەنجامی دەدات‌و لەهەر کات‌و ساتێکدا بێت جیاوازییەکی ڕاستەقینە لای فەرمانبەران بەدی دێنێت.

٩- سەرنجی کارە ئەنجامدراوەکان بدە:

هەرکاتێك کارێکی گرنگ ئەنجامدرا یاخود پرۆژەیەك کۆتایی پێهات یان ئامانجێك بەدیهێنرا، ئەمانەو گیانی هەستکردن بە ئەنجامدانی کارەکە بۆ هەمووان ڕوونکەرەوە، بەم کارەش هەستکردن بەسەرکەوتن‌و گەشەکردن‌و شانازی‌و گیانی پێکەوە کارکردن پەرە دەسێنێت.

١٠- خەمخۆرو بە پەرۆشبە بۆ فەرمانبەرەکانت:

دڵنیابە ئەنجامدانی کارەکانی داهاتوو بەندە لەسەر فەرمانبەرەکانت، هەوڵبدە بە باشی لە هەریەکێکیان تێبگەیت‌و ئەرکەکانیش بەپێی توانایان دابەش بکە بەسەریاندا.. بەشێوەیەکی بەردەوام کۆشش بکە بۆ باشترکردنی ڕەوشی کارکردن لەسەر ئاستی دامەزراوەکەت بەگشتی، بەشێوەیەکی تایبەتیش گرنگیدانت بە ئامانجەکان‌و درەوشانەوە پیشەییەکان بۆ فەرمانبەرەکانت بخەرەڕوو.

سەرچاوە: نشرة (النخبة الادارية) العدد:١

# مێروولەو بەڕێوەبردن!!



و/م/ بێگەرد هەورا

هەموو رۆژێك مێروولەیەكی بچووك زۆر بە گورج و گۆڵییەوە بەرەو كارەكەی بەڕێ دەكەوت و پێش هەموو ئەوانی تر دەكەوت، بەوپەڕی دڵ خۆشی و ئاسوودەییەوە بەرهەمێكی باشی بەدەست دەهێنا، لە كارو توانای مێروولەكە شێری بەرپرس سەرسام دەبێت، زیاتریش بە هۆی ئەوە بوو كە مێروولەكە بێ ئەوەی بەرپرس یان چاودێرێكی هەبێت لە راپەڕاندنی كارەكانیدا لەوپەڕی چوست و چالاكیدایە.

بۆیە بیری كردەوە ئەم مێروولەیە خاوەنی ئەم هەموو هێزو تواناو وزەیەیە بێ سەرپەرشتی كردنی هیچ لایەك هێندە بەرهەم هێنە، ئاخۆ ئەگەر كەسێك سەرپەرشتی كارەكانی بكات، بەرهەمی چەند زیاد بكات؟

لەبەرئەوە هەستا بە دامەزراندنی سیسركێك كە شارەزاییەكی باشی هەبوو لە سەرپەرشتیكردن و نوسینی راپۆرتدا، پاش دەست بەكاربوونی یەكەم بڕیاری دەركرد ئەویش دانانی سیستەمی ئامادەبوون و دەرچوون بوو.

پێویستی بەدامەزراندنی سكرتێرێك بوو بۆ نوسینەوەی راپۆرتەكان و پێویستییەكانی تر، بۆیە هەستا بە دامەزراندنی جاڵجاڵۆكەیەك بۆ بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی و چاودێریكردنی گفتوگۆ تەلەفۆنییەكان.

شێرەكە زۆر خۆشحاڵ بوو بە بینینی راپۆرتەكان كە بە وێنەی بەیانی روون كرابوونەوەو شیكرابوونەوە بۆ خستنە روویان بۆ ئەنجومەنی بەڕێوەبردن.

سیسركەكە هەستا بەكڕینی ئامێرێكی كۆمپیوتەرو پرنتەرێكی رەنگاورەنگ، مێشێكی دامەزراند بە بەرپرسی رێكخستنی زانیارییەكان.

مێروولەی چالاكیش كە كارەكانی بەوپەڕی لێهاتوویی بەجێ دەهێنا، پێی خۆش بوو ئازادانەو بێ سەرپەرشتیارو سانسۆر كارەكانی جێبەجێ بكات، دڵخۆش نەبوو بەو گۆڕانكاریانەی كە روویان دا، پەرەی زۆر لە سیستەمی نوێ و كۆبوونەوەكان دەبووە هۆی لە دەستدانی كاتی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی كارەكان بێزاریان كردوو ئەوەش بووە مایەی ساردبوونەوەو گرنگی نەدان بە باش بەڕێوەچوونی كاروفرمان، لێرەدا شێری بەرپرس هەستی بە بوونی كێشەیەك كردو ویستی ئالییەتی كارەكان لە بەشەكەدا بگۆڕێ.

هەستا بە پێشكەشكردنی ئەو پلەو پایەیە بە كوللەیەكی شارەزا لەبواری گەشەسەندنی بەڕێوەبەرایەتی، پاش دەست بەكاربوونی یەكەم بڕیاری بڕیتی بوو لە كڕینی كەل وپەلی نوێ و فەرش بۆ حەوانەوەی فەرمانبەرەكان، هەروەها كڕینی كۆمپیوتەرێك و دانانی یاریدەدەرێك كە پێشتر كاری لەگەڵ كردبوو، بۆ یارمەتیدانی لە دانانی ستراتیژیەتی گەشەو دانانی بودجەدا...

ئەو بەشەی كە مێروولەكە كاری تێدا دەكرد بووە بەشێكی خەمناك و هیچ پێكەنین و خۆشی تێدا بەدی نەدەكراو نائومێدی و بێ هیوایی باڵی كێشابوو بەسەریا.

لێرەدا سیسركەكە هاتە لای شێر و پێشنیاری لێكۆڵینەوەی لە ژینگەی كارەكەدا كرد.

دوای چاو پێداخشاندن و لێكۆڵینەوە شێر بۆی دەركەوت بڕی تێچوونەكان لە جارانی پێشوودا زۆر كەمتر بوون وەك لە تێچوونەكانی ئێستادا، بۆیە پێویست بەوە دەكات كەمكردنەوە لە خەرجییەكەدا بكرێت، بۆ ئەم كارەش هەستا بە دامەزراندنی كوندەپەپوویەك وەك راوێژكاری بەڕێوەبردن و وردبین لەخەرجییەكاندا بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاوی كێشەكە.

دوای لێكۆڵینەوەو وردبینی كە سێ مانگی خایاند كوندە پەپووەكە هەستا بە بەرزكردنەوەی راپۆرتێكی گرنگ كە باسی لەوە دەكرد بەشەكە زۆر لە رادەی خۆی گەورەترە لەبوونی فەرمانبەردا، واتە ژمارەی فەرمانبەرەكان بۆ ئەو بەشە زۆرن و بەشەكەیان پێویستی بەو ژمارە زۆرە لە كارمەندان نییە!!

واتە پێویست بەوە دەكات رێژەی فەرمانبەران كەم بكرێتەوە...

بە بۆچوونی تۆ یەكەم فەرمانبەر كە شێرەكە هەڵدەستێ بەلابردنی لەسەركار كێیە؟

مێروولەكە؟ سیسركەكە؟ جاڵجاڵۆكەكە؟ مێشەكە؟ كوولله یان كوندەپەپووەكە؟

بێگومان فەرمانبەری لەسەركار لابراو مێروولەكە دەبێت، بەهۆی كەمتەرخەمی و كەموكورتی و باش كار نەكردن دوای گۆڕانكاری لەسیستەمی كاركردندا.

دەتوانین بڵێین: كەسی چالاك و سەركەوتوو ئەو كەسەیە كە بتوانێت بەهەمان چوست و چالاكی و لێبڕانەوە وزەو توانای بخاتەگەڕ هەرچەند گۆڕان لە شوێن یان پلەو ژینگەی كارەكەیدا روویدات، نەوەك لەسەرەتادا چالاك بێت و پاش گۆڕانی كارەكانی ساردی رووی تێ بكات و نەتوانێ لەگەڵ سروشتی كارو كەسایەتییەكانی كارەكەیدا خۆی بگونجێنێت، كەواتە پێویستە مرۆڤ دەق بە یەك شێوازی كاركردنەوە نەگرێت و هەمیشە لەگەڵ گۆڕانكارییەكاندا خۆی بگونجێنێ و چالاكی و بەرهەمی لە برەودا بێت.

سەرچاوە/ ئینتەرنێت.

ئامادەکردنی خشتەی مەوعیدەکان:

دەکرێــت بەزۆر رێگــە مەوعیــدەکان دیاری بکرێــن، هەندێجــار بــە رێگەی تەلەفــۆن یاخود بەئامادەبوونی خودی کەسەکە مەوعیدەکە دیاری دەکرێت ئەمەش بەرێگەی نووســینی یاداشــتێك ئەنجام دەدرێت.

بــۆ دڵنیابــوون لــە وردیو رێكوپێكــیو دوورکەوتنەوە لەهەر کەموکوڕیو لەبیرچوونێك لە بەجێهێنانی ئەم کارە گرنگەدا، پێویستە پارێزگاری لەو خشتەیە بکرێتو راستەوخۆ هەر مەوعیدێکی تێدا تۆماربکرێت کە داوای دیاریکردنی دەکرێت.

لە کاتی تۆمارکردنی مەوعیدەکاندا پێویستە رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

- ناوی ئەو کەسانەی کە لە چاوپێکەوتنەکەدا ئامادە دەبن.
- ناوی ئەو دامەزراوەیەی کە کاری لێدەکات.
- پلەوپایەی میوانەکە.
- بەروارو کاتی چاوپێکەوتنەکە.
- شوێنی چاوپێکەوتنەکە.
- ژمارە تەلەفۆنی میوانەکە.
- بابەتی سەردانەکە.

★ سکرتێرو گرنگی شێوازی پێشوازیکردن:

ئەگــەر ســکرتێر خاوەنــی کەســایەتیەکی کارامەو لێهاتوو نەبێت لە چۆنیەتی مامەڵەکردنو شــێوازی پێشوازیکردنی میوان، رەنگە رووبەرووی چەندیــن گرفــتو هەڵوێســتی جیــاواز ببێتەوە لەگەڵ میوانەکانــی، جا لە دەرەوە یان لە ناوخۆی دامەزراوەکــەدا بێت، لەبەرئەوە دەبێت ســکرتێر شــارەزایی ئەو کاروبارو رێوشــوێنانە ببێت کە لە کاتــی پێشــوازیکردنی میواندا پەیــرەو دەکرێن، ســەرەرای فێربوونــی بنەماکانــی ئەتیکێتــی میوانداری کە پێویســتە لە کاتــی بەڕێوەچوونی پرۆسەی پێشوازیکردندا بەکاربهێنرێن.

★ رێوشوێنی کارگێری:

- پێویستە شــوێنێکی ســەربەخۆو تایبەتو ئاسودەبەخش لە تەنیشت نوسینگەی بەڕێوەبەرەوە دابین بکرێت بۆ چاوەڕوانیکردنی میوانەکان.

- ئامادەکردنی کاتی سەردان کردن، بەتایبەت بۆ ئەو میوانانەی کە بەبێ مەوعیدی پێشوەخت سەردان دەکەن.

- بــۆ پێشــوازیکردنی کەســایەتییە گرنگو ناســراوەکان، پێویســتە کەســێك لەبــەر دەرگای سەرەکی دامەزراوەکە ئامادەبێت بۆ پێشوازیکردنو بەخێرهێنانــی میوانەکــەو هاورێیەتــی کردنی تــا شــوێنی چاوپێکەوتنەکــە، دەکرێــت کەســی پێشوازیکەر لە تەنیشت میوانەکەوە بڕوات یاخود بە چەند هەنگاوێك پێشی بکەوێت.

- رووخســارو رواڵەتــی ســکرتێرو دیمەنــی نوســینگەکەیو هەمــوو ئــەو کەلوپەلانەی کە تێیدایە رۆڵی خۆیان هەیەو شوێنەواری گرنگ لای میوان جێدەهێڵن، لەبەرئەوە پێویســتە ســکرتێر گرنگــی بــە رووخســاری بــداتو نوســینگەکەی رێكوپێكو پاكوخاوێن رابگرێتو کەشێکی ئارامو ئاسودەبەخشی تێدا فەراهەم بهێنێت.

- ئــەو میوانانەی کە لــە کاتی خۆیاندا ئامادە دەبن نابێت پشتگوێ بخرێنو زۆر چاوەرێ بکەن، لە کاتێکدا ئەگەر بەڕێوەبەریش ســەرقاڵ بوو بە چاوپێکەوتنی ترەوە، دەبێت ســکرتێر پۆزشــیان بۆ بهێنێتەوە بۆ دواکەوتنی چاوپێکەوتنەکەیانو دڵنیایــان بکاتەوە لەوەی کــە بەڕێوەبەر پابەندە بــە بەڵێنەکەیــەوەو لــە نزیکترێــن دەرفەتــدا چاوپێکەتنەکە ئەنجام دەدەن.

★هەندێ ئەتیکێتی پێشوازیکردنی میوانو میوانداری:

- پێویســتە بــە رووخۆشــیو بــە زەردەخەنەی جوانو هێمن پێشوازی لە میوان بکرێتو بە شێوەیەکی نەرمونیانو لەسەرخۆ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

- کاتێــك میوانێك بــە بەڕێوەبەر دەناســێنرێت پێویســتە بە شــێوازێکی رێكوپێكو بە دەربرینێکی تەواو ناوی میوانەکەو پۆستو پلەکەی بوترێت. بەڵام ئەگەر چەند میوانێك بوون دەبێت بەپێی بەرزو نزمی پۆستەکەیان رەچاوی ئاستی کارگێرییان بکرێت.

- دوای پێناســاندنی میوانەکە بە بەڕێوەبەر، پێویســتە راســتەوخۆ ســکرتێر نوســینگەکە جێبهێڵێت، ئەگەر داوای چاوەڕوانکردنی لێنەکرا.

- لە کاتی وتووێژکردن لەگەڵ میوانەکەدا هەوڵبدە زاڵبیــت بەســەر دەنــگ هەڵبرینو بەرزکردنەوەی دەنگت بە شێوەیەکی بێزارکەر، یان نزمکردنەوەی بە شــێوەی چپەچپکردن، دڵنیابە لە دروستی دەربرینی دەســتەواژەکانو وردەکاری قســەکانت، بــا خێرایی قسەکردنیشــت مامناوەند بێت تاکو مۆرکێکی باشو جوان لای میوانەکە جێبهێڵێت.

- دڵنیابــە لــە دابینکردنــی پێویســتییەکانی میوانداریو پێشکەشــکردنی لە کاتی گونجاودا، وەك پێشکەشکردنی ساردەمەنیو چاییو قاوە، لە حاڵەتی دواکەوتنــی پێشکەشــکردنی ئــەم پێویســتیانەدا، بەڕێوەبەر رووبەرووی شەرمەزاری دەبێتەوەو رەنگە چاوپێکەوتنەکەش ساردوسڕی پێوە دیاربێت.

- دوای کۆتایی هاتنی سەردانەکەو بەرێکردنی میوانەکە، لە نوســینگەکەتەوە تــا دەرگای دەرەوە هاورێیەتی بکەو بە شــێوازێکی جوانو لەسەرخۆ ماڵئاوایی لێبکە.

سکرتاریەت

# پێشوازیکردنی میوان و رێکخستنی چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێوەبەردا ٢/٢

زنجیرەی چواردەیەم



## ١١٣ شێوازو ڕێگا بۆ یارمەتیدانت لەسەر بەرزکردنەوەی ڕێژەی بەرهەمهێنان و زاڵبوون بەسەر ڕێچکەی دواخستندا

# چۆن زۆرترین بەرهەم لە کەمترین کاتدا بەدەست دێنیت؟

بەشی پێنجەم

٧٤- هەر ئێستا هەڵسە بە کاری بەرهەم هێنەر، بزانە کە لوتکەی هێزو توانات لەم ساتەیە هەر ئێستاو هیچ شتێکی تر لەم ساتە گرنگتر نییە لە رابردووو نە لە داهاتوو، بە بێ هیچ گومانێك، ئەو کاتەی کە متمانەی دەکەیتە سەر تەنها خولەکەکانی ئەم ڕۆژەتەو بە فیرۆیان مەدە.

٧٥- هەموو ئەو شتانە ئامادەبکە کە کۆشش کردنت زیاد دەکەن، هەڵسە بە دابینکردنی ئەو دۆکۆمێنتانەی کە پێشتر بە کارت هێناون لە کارە لە یەکچووەکان، هەموو کات بە بەردەوامی کورتە نامیلکەو خشتەی کارو کۆبوونەوەو راپرسیو داواکارییە نووسراوەکان، هەموو ئەو نموونە سادانە لە سەر دۆکۆمێنت زۆربەی جار بە کاردێنەوە.

٧٦- هەموو کات چاودێری خودی خۆت بە، لەو ڕۆژانەی کە دەتەوێ دەربازبی لە خاڵە گرنگەکان، حوکمی خودی خۆتو پرۆگرامەکەت بکە، ئاسانترین ڕێگا بۆ پەرەپێدانی خود بریتییە لەوەی کە هیواو ئاواتی دیاریکراوت هەبێت بە درێژایی کات، ئامانجیشت هۆیەکە بۆ ئەوەی ئێستا دەیکەیت، هەموو کات ئامانجت لە یاد بێت ئەوەی کە هەوڵی بۆ دەدەی وزەی پێویستت پێ دەبەخشێ بۆ زاڵبوون بە سەر بەربەستەکاندا.

٧٧- راستەوخۆ رووبەرووی بەربەستەکان بەرەوە، زۆرجار وادەبێ کە کاتی دیاریکراو بۆ هەنگاوی گرنگتر بەشی تەواوکردنی ناکات، ئەگەر حاڵیشمان ئەوها بێت باشترین شت ئەوەیە کە هەر ئێستا هەموو توانای خۆت کۆبکەیتەوەو ئێستا دەست بە کارەکەت بکەیت، بە ورە بەرزییەوە کاربکە، هەموو کات وایە کارەکان بەو زەحمەتییە نییە کە پێشبینیمان دەکرد.

٧٨- ئەگەر کرا داوای یارمەتی لە کەسانی تر بکە، بەردەوام بە دواداچونیان بۆ بکە بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە لە سەر ڕێگای ڕاستو کاتی دیاریکراودان، زۆرجار پشت بەستن بە توانای کەسانی تر پاڵپشتێکی باش دەبێت بە تایبەتی ئەگەر ڕێنمایيو ڕاهێنانی تەواویان پێکرابێت.

٧٩- سیستەمێکی باش بۆ فایلەکان بنیات بنێ، هیچ شتێك ورەت بەرنادات جگە لە زانینت بەوەی کە ئەو شتانەی پێویستە، بەڵام ناتوانی شوێنەکانیان دیاری بکەی، یەکێك لە ڕێگاکانی بنیاتنانی ئەو سیستەمە بریتییە لە دانانی ڕێبەری فایلەکان لە شوێنێکی بەرچاو، پۆلێن کردنیان بە ژمارەو یاخود پیتی (هجائی)، لەگەڵ بوونی شوێن بۆ هەر فراوان کردنێکی تایبەت پێوەی، لە کاتی زیادکردنی هەر فایلێك لە ڕێبەرەکەدا بینووسە، هەموو شتێك لە شوێنی دیاریکراو دابنێ تا لە کاتی پێویستدا بە ئاسانی بیدۆزیتەوە.

٨٠- هەموو کات پلانی ڕۆژانەو پەڕاوی تێبینییەکان لە نزیك خۆت دابنێ، بیرو ڕاو تێبینیەکانو هەر زانیارییەکی تر کە بە خەیاڵتدا دێ لە هەر کاتێکدا بینووسە، وا دابنێ لە کاتی سەرقاڵیت بە کاری ترەوە ئەم بیرۆکەیەت بۆ بێ، تێبینیە ناگرنگەکانت تۆماربکە کە دەتەوێ لە کۆتایی ڕۆژدا تاوتوێی بکەی لە گەڵ کەسانی تر.

٨١- بە پەلەو وردبینی بڕیارەکانت بدە، ئەوانەی کە بەشدارییان لە سەرکەوتن کردووە پەلەیان کردووە لە بڕیارداندو پابەندبوون پێوەی، کاتی خۆت بە فیرۆ مەدە بە دوودڵی، بەڵکو هەڵوێستەکە بە باشترین شێوە هەڵسەنگێنەو لە دوایدا بڕیاری لە سەربدە، ئەوەش بزانە کە هەموو بڕیارێك بە پەلە بڕیاری لە سەر نادرێت جگە لە بڕیارەکانی ڕۆژانەو تاوەکو تاقی بکەیتەوە ئاستی توانست بەرزدەبێتەوە.

٨٢- کاتیوەڵامدانەوەت بۆ تەلەفۆنو فاکسو پۆستە کورت بکەرەوە، فێربە کە چۆن

به ئاستێکی بەرز تەلەفۆن بەکاردەهێنیت بۆ وەڵامدانەوەکانی کە دواکەوتوونو مەرجیش نییە بەو شێوەی کە بۆت هاتووە بە هەمان ڕێگا وەڵامی بدەیتەوە، وەکو پەیوەندییەکی تەلەفۆنی کارەکانت ساناتر دەکەن لەوەی کە بە فاکس وەڵامی دەدەیتەوە.

٨٣- ئاگاداریو پارێزگاری تەندروستی خۆت بکە، چونکە پێویستە بۆ هەڵسان بە باشترین کار، کاتی خۆت ڕێکبخە لە پێناو ژیانێکی باشتر، کە دەبێتە هۆی تەندروستییەکی باشو ژیانێکی ڕێكوپێك، پێویستیت بە تەندروستییەکی باشە بۆ چێژوەرگرتن لە ئەنجامدانەکانت، هیچ لەو گرنگتر نییە، مانەوەت لە سەر بارێکی تەندروستی باش وزەو توانای بەرگە گرتنت پێ دەداتو وات لێدەکات کە زۆرتر کەسێکی کراوەو کەمتر دوودڵ بی.

٨٤- بە بەردەوامیوەرزش بکە، مامەڵە لەگەڵ لاشەت بکەوەك ئامێرێك کە پێویستی بە چاکسازی هەبێت، دەبێتە هۆی کارکردنی بە شێوەیەکی باشترو بۆ ماوەی دوورو درێژتر، هەر جۆرێك لە وەرزش یارمەتیدەرتە کە کەسێکی چالاكو تەندروست بی، حەسانەوەش پاش ماندوو بوون لاشەی مرۆڤ بەهێزو پتەو دەکات.

٨٥- فێر بە کە چۆن بە شێوەیەکی بە پەلە بخوێنیتەوە، بوونی خولو پەرتووك لەم بارەیەوە یارمەتیدەرتەو زۆر ئاسانیشە بۆ کەسێکی مامناوەند لە خوێندنەوە توانای خۆی بەهێز بکات بە یارمەتی هەندێ بیرو تەکنیکی سانا، بەشداریکردن لە خولەکان بەردەوامی لە سەری نیوەی کاتی پێشووت بۆ دەگێڕیتەوە بەمەش کاتی زیاترت دەبێت بۆ چالاکییەکانی تر.

٨٦- هەموو کاتێك لە ئامانجەکەت وردبەرەوە، ئامانجەکەی خۆت بناسە، درکی پێوە بکە هەست دەکەیت بە بە ئەنجام گەیاندنی هەر کارێکتو بە شێوەیەکی روون ئەوەت لە خەیاڵ بێ کە هەوڵی بۆ دەدەی، لەو کاتەدا هەست دەکەیت بە پێویستی کارکردنو کۆشش کردن بۆ بە ئەنجام گەیاندنی.

٨٧- پابەند بە بە خشتەی کارەکانتەوە، ئاساییە کە شتی تر بێتە پێش بۆ ئەوەی شیرازەی بیرکردنەوەت بپچڕێنن، لێرەدا پێویستە کە خۆت سەغلەت نەکەی، ئەگەر شتێکی وا هاتە پێشەوە، تێبینی بکەو وردەکارییەکانی بۆ بنووسەو دوای بخە بۆ کاتێکی تر، دوای ئەوەی لە کارە گرنگەکە تەواو دەبی، بگەڕێوە سەر تێبینییەکانتو مامەڵە لەگەڵ هۆکاری پچڕاندنت بکە.

# پەیوەندی بەڕێوەبەر بە قوتابییانەوە

بەهرۆز شێرزاد / چەمچەماڵ

قوتابخانەو پرۆگرامو بەڕێوەبردنو یاسای پەروەردەیی، هەموویان هۆکارو دامەزراوەن بۆ یارمەتیدانو گەشەپێدانی لایەنی لاشەییو کۆمەڵایەتیو هۆشمەندی قوتابیان سەری هەڵداوە، قوتابی هۆکارو ئامانجی فێربوونو پەروەردە دەزانێتو هەوڵ دەدات بۆ دروستکردنی کەسێتییەکی بەهێزو تەواو، تاوەکو بتوانێت بە شێوەیەکی راستودروست، رەفتار بکاتو توانای بڕیاردان چارەسەرکردنی ئەم رەفتارانەی هەبێت، کە لەبوارە جیاوازەکانی ژیاندا ڕووبەڕوی دەبێتەوە.

لەم روانگەیەوە پێویستە، بەڕێوەبەر پەیوەندییەکی دروستو بەهێز، لەگەڵ قوتابیانیدا دابمەزرێنێ، تاوەکو بتوانێت ئامانجە پەروەردەییەکان بهێنێتە دی بۆ دروستکردنی ئەو جۆرە پەیوەندییە، دەبێت بەڕێوەبەر بە تەواوی شارەزابێت لە:

أ- لایەنەکانی گەشەو گەورەبوونی منداڵ، تاوەکو پێداویستی قوتابیان بزانێت.

ب- کێشەو ئاڵۆزی هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشە کردن بزانێت، کە بە هۆیەوە بەڕێوەبەر دەتوانێت بە ئاسانیو بەپێی قۆناغەکانی گەشەکردنو تایبەتمەندێتی ئەو قۆناغە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات.

ج- هەڵبژاردنی چالاکیو شارەزاییو کاری گونجاو بۆ هەموو قۆناغێ لە قۆناغەکانی گەشەکردن، چونکە گرفتەکانی قوتابی لە قۆناغی سەرەتاییدا جیاوازە لە قۆناغەکانی دیکە، جگە لەوەی کە گرنگی پێدانو ئارەزووی قوتابیان لەو قۆناغەدا، جیاوازە لەگەڵ قۆناغەکانی تردا.

لەبەرئەوە پێویستە بەڕێوەبەر ئاگاداری ئەو جۆرە مامەڵەو هەڵسوکەوتە بێت کە لەگەڵ قوتابیاندا دەیکاتو پێویستە رەفتاری گونجاو بێ، لەگەڵ قۆناغی گەشەکردنەکەی، کە قوتابیەکە تێیدایەتیو پێی گەیشتووە.

ئەرکەکانی بەڕێوەبەر لەم بوارەدا دیاری دەکرێت لەم خاڵانەی لای خوارەوەدا:

١- گرنگیدان بەو کێشەو گیروگرفتانەی، کە رووبەڕوی قوتابیان دەبنەوە، لە ناو قوتابخانەو دەرەوەیداو بەهاوکاری هەموان چارەسەری گونجاویان بۆ بدۆزێتەوە.

٢- گەشەپێدانی رووەو بۆچوونی دروستو بەجێ لە ناخی قوتابیاندا، ئەمەش بە ئامادەکردنی کەسێکی لەبارو گونجاو بۆ قوتابیان، تاوەکو هەڵسن بەو چالاکیو کردەوانەی کە دەبێتە هۆی چاندنو گەشەپێدانی ئاراستە چاکەکان.

٣- پەیرەوکردنی دادپەروەریو یەکسانی لەگەڵ قوتابیاندا بە شێوەیەك کە جیاوازی نەکات لە نێوان قوتابیاندا، تاوەکو هەموویان هەست بکەن، کە بەڕێوەبەر هاورێی هەموو قوتابییەکەو ئامادەیە یارمەتیان بدات بە بێ جیاوازی.

٤- هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی پەیوەندی، لەسەر بنەمای رێزو خۆشەویستیو بواردان بە قوتابیان، تاوەکو بۆچوونەکان بەسەربەستی دەربڕن بەبێ ترسو دڵەڕاوکێ، چونکە ئەمە یارمەتی قوتابی دەدات بۆ هەستکردن بەشانازی کردنو بڕوابوون بەخۆ و رێزگرتنی بەرامبەرو خۆشەویستی بۆ کەسانی تر.

٥- هەوڵ بدات قوتابیان چالاکییان هەبێت، ئەگەر زۆر سادەو ئاسانیش بن، تاوەکو هەست بە بوونو بەرپرسیاری خۆیان بکەن.

٦- ئاگادارکردنی قوتابیان لەو تەنگوچەڵەمانەی لە دەوروبەریاندایەو هانیان بدات کە راوبۆچونی خۆیان دەربڕنو چارەسەریان بۆ دابنێن، ئەگەر زۆر سادەو ئاسایش بێت.

٧- هەوڵ بدات بۆ بەهێز کردنی پەیوەندی نێوان مامۆستاو قوتابیو گیانی خۆشەویستیو دڵسۆزی گەشە پێ بدات لە نێوانیاندا، چونکە ئەم جۆرە پەیوەندییە رادەی رێزو خۆشەویستی قوتابی بۆ مامۆستاکەی زیاد دەکات.

سەرچاوە: بەڕێوەبردنو سەرپەرشتی کردنی پەروەردەیی.

## کێشە و بڕیار

م. ڕێباز محمد صادق

# کۆمپانیای خوان



# ناخۆشتر ئەوەیە کارمەندەکانت لای ڕکابەرەکانت کار بکەن!

کۆمپانیای (خوان) کۆمپانیایەکی ناو خۆییە، ئەکتیڤە لە پەخشکردنی بەرهەمە خۆراکیەکاندا، لە مێژە پسپۆری ئەو بوارەن بۆیە توانیویانە تۆڕێکی بەربڵاو دروست بکەن بۆ پەخشکردنی ئەو بەرهەمانەی کە لە وڵاتانی دەرەوە هاوردەی دەکەن. کەم مارکێتو مینی مارکێت هەیە کە زیاتر لە (١٠) جۆر کاڵا لە کۆمپانیای خوان وەرنەگرێ.

کێشەی سەرەکی ئەم کۆمپانیایە لەگەڵ کارمەندەکانی بەشی پەخش کردندایە، ئەوانەی لە تۆڕی پەخشکردنەکەدان کاردەکەن دوای ماوەیەك دەبنە کەسێکی سەربەخۆو بۆ خۆیان سەیارەیەکی گونجاو دەکڕنو دەست دەکەن بەو کارە. ئەمە تارادەیەك ئاساییە، بەڵام هەندێجارئەو فەرمانبەرانە سەنگەر دەگوێزنەوە بۆ کۆمپانیایەکی هاوپیشەو لەوێوە دەست دەکەن بەهەمان کار، ئەم کارە گورزی کوشندەیە بۆ جەستەی کۆمپانیای (خوان)، چونکە بە هۆی کارمەندەکەوە کریارەکەش ئەگەری گواستنەوەی مامەڵەکانی هەیە بۆ لایەکی تر.

ئیدارەی کۆمپانیا بیری لە چەندین چارەسەر کردۆتەوە بۆئەوەی وەلائی فەرمانبەرانی بپارێزێ، لەو چارەسەرانەش:

١- زیادکردنی موچەی کارمەندەکە، بە جۆرێك هەست بکات دەستکەوتێکی باشی هەیە، بەڵام دەرکەوتووە کە چەندجارێك کارمەندەکان موچەشیان باشبووە، لەگەڵ ئەوەشدا پابەندی کارەکەیان نەبوون لە کۆمپانیاداو دواجار وازیان هێناوە.

٢- دانانی کەسێك لەگەڵ ئۆتۆمبێلی پەخشکردنەکەدا بە ناوی ژمێریار، تاوەکو هەموو کارەکانی ناسینو مامەڵەی کریارەکان لای شۆفێرەکە نەبێتو ئەویش دواجارماڵئاوایی بکات. بەڵام ئەم کارە لە رووی مادديیەوە بارگرانی بوو، چونکە ئەگەر هەریەکەیەکی پەخشکردن پێویستی بە (٥٠٠) دۆلار موچەی زیادە هەبێت، ئەوا سەرجەم دەکاتە (٤٥٠٠) دۆلار بۆ هەر مانگێك، چونکە کۆمپانیا (٩) یەکەی پەخشکردنی تایبەت بەخۆی هەیە.

٣- پێشنیارێکی تر ئەوە بوو کە خاوەنی کۆمپانیا پشت ببەستێت بە خزمو کەسەکانی، تاوەکو بۆ یەکجاری لەو سەرئێشەیە رزگاری ببێت، بەڵام دوایی دەرکەوت کە جیاوازی لە نێوان ئەوانو کارمەندانی تردا تەنها ناوەکانیانەو هەمان تەرزی ئەوانی ترە.

٤- چەند پێشنیارێکی تر کراوە لەوانە: کۆمپانیا هەستێ بە دابەشکردنی یارمەتی تایبەتی بۆ کارمەندەکانی وەك: دابینکردنی کرێی خانوو.

دوای گرتنە بەری چەندین ڕێگە چارە، ئێستا (خوان) رەشبینە بەرامبەر بەو دیاردەیە، بەتایبەتی کە ئەویش یەکێك بووە لەو کۆمپانیایانەی پێشوازی کردووە لە کارمەندی رکابەرەکانی. هەرچەندە ئەمان حەزیان نەکردووە بەوەی کە شوێن پێی کارمەندی کۆمپانیاکانی تر هەڵگرن، بەڵام مەبەستیانە کە هیچ کۆمپانیایەك شوێن پێی ئەمان هەڵنەگرێت.

* ئەو دۆخە لە تەمەنی کۆمپانیاکانی پەخشکردندا دۆخێکی سروشتییە، لە قۆناغێك لە قۆناغەکاندا وازهێنانی کارمەندەکانی کە لە

گەیاندنی کاڵادا کاردەکەن، لەوانەیە ئیدارەی کۆمپانیا سەرقاڵ بکات تا رادەی شپرزەیی لە بیرکردنەوەو بریاردا. هۆکاری خودی ئەو دیاردەیە بە نیسبەت کارمەندەکەوە زۆرجار کورت بینی کارمەندەکەیە، ئەو وادەزانێ ئەوەی بۆ کۆمپانیاکەی دەکات بۆ خۆی بکات باشترە، بەڵام کە بۆ خۆی دەست دەکات بەو کارە ئنجا دەزانێت کە هەڵە بووە لە بینینی قەبارەی پرۆژەکەیدا، ئەمەش وادەکات دیسانەوە بچێتەوە ژێر باڵی کۆمپانیا، بەڵام ئەمجارەیان کۆمپانیایەکی تر.

* بە زۆری ئەم دیاردانە لەو کاتانەدا زۆر دەبێت کە هێشتا کۆمپانیاکە نەیتوانیوە هەژمونی خۆی لە بازاردا بسەلمێنی، جا ئایا بەهۆی کەمتەرخەمی ئیدارەکەیەوە، یاخود بەهۆی لاوازی لە ئیمدادو دابینکردندا، یا گوێ نەگرتن لە کرێکارەکان، یان نەبوونی پاڵپشتی ریکلامی بۆ کۆمپانیا، یا لەناکاودا داتەپینی ئابووری، ..... چەندین هۆکاری تر .

چەندێك نەبوونی هەژموون کۆمپانیا نزیك دەکاتەوە لەو کێشەیە، کاتێك هەژمونی هەبێت لە بازاردا ئەوا کارمەندەکان بە سەربەرزی دەزانن کە موچە لەو کۆمپانیایە وەردەگرن.

* ئەگەر لە گۆشەیەکی ترەوە سەیری حاڵەتەکە بکەین، ئاساییە کە کارمەندەکە هەوڵبدات ببێتە خاوەنی کاری خۆی ئەمەش نابێ ئیدارەی کۆمپانیا وەڕەس بکات، بەڵکو پێویستە بەسەربەرزی بزانێت کە کەسانێك لە رێی ئەمانەوە بوونەتە خاوەنی کاری خۆیان، ئێستا کۆمپانیا زەبەلاحەکان کار لەسەر ئەو تەوەرە زۆرە دەکەن کە وەك قوتابخانەیەك بن بۆ پێگەیاندنی کەسانی کۆمەڵگاکانیان، ئەویش بەوابەستەکردنی مەبەستەکانی کۆمپانیا بە ئامانجە مرۆڤایەتیەکانەوە. بۆیە بوونی ئەو دۆخە ئاساییە بەڵام کاتێك دەبێتە دیاردە ئەوە جێی پرسیارەو پێویستە بنەبربکرێت.

* ئەو رێگەچارانەی پێشنیاری کۆمپانیای (خوان)ن، تەنها چەند خاڵێکی رووکەشن، راستە بەزیادکرنی موچەی کارمەندەکە لەوانەیە بتوانێت تارادەیەك بەرلەو دیاردەیە بگرێت، بەڵام ئایا بەچ میکانیزمێك؟ ئایا دواجار بارێکی گرانی موچە ناکەوێتە سەرگیرفانی کۆمپانیا؟ ئەی ئایا کۆمپانیا نابێتە تەممەڵخانە بۆ ئەو کەسانەی موچەیان زۆرە تەنها لەترسی ئەوەی نەڕۆن؟ ئەی ئایا پێشنیاری دووەم راکێشانی بەرەی ژێر پێی شۆفێرەکە نییە بۆ ژێرپێی ژمێریارەکە؟

* بەنیسبەت موچەی کارمەندەوە باشترین پێشنیار ئەوەیە موچەی کارمەندەکە وابەستەی بری فرۆشتنەکانی بکرێت واتە راستەوانە بێت لەگەڵ بری زیادەفرۆشی خۆیدا.

***        ***        ***

جگە لەو خاڵانەی پێشنیاری ئەوان بووە چەند خاڵێکی تریش دەکرێت ببێتە رێگە چارە لەوانە:

١- پێویستە لە ئاستە باڵاکانی کۆمپانیادا کەسێك یان چەند کەسێك پێی هەڵسن ئەویش دابەزینە بۆ ناو کۆمپانیاو نزیکبونەوەی لە کریارەکانە بە مەبەستی ناسینیان، زانینی کێشەکانیان لە بازارداو زانینی گرفتەکانیان لەگەڵ کۆمپانیای (خوان) دا ئەمە جگە لەوەی کە هەنگاوێکە بۆ هەژمونکردنی ناوی کۆمپانیاکە. هۆکارێکیشە بۆ بەردەوام وەرگرتنی ئەو زانیاریانەی بۆساغکردنەوەی بەرهەمەکان پێویستن، هەر گۆرانێك لە ئاکاری کریارەکاندا هەبێت ئەمان راستەوخۆ هەستی پێ دەکەن، ئەم مەیدانی بوونە کلیلی زۆرێك لە گەورە پیاوانی بزنس بووە، بۆ نموونە (جان کالرزۆن) بەرێوەبەری جێبەجێکاری هێڵی ئاسمانی (ساس)ی ئەمریکی لە هەفتەکانی سەرەتای وەرگرتنی پۆستەکەیدا وەك گەشتیارێکی ئاسایی بلیتی سەفەری دەبری‌و لە تیرمیناڵو هۆڵەکانی چاوەڕوانیدا لەگەڵ گەشتیاراندا دەدواو تێبینییەکانی خۆی تۆمار دەکرد.

٢- دابینکردنی بودجە بۆ هەڵمەتی ریکلامی بۆ ناوی (خوان) تاوەکو ببێتە پاڵپشت بۆ کۆمپانیاکەو بە هۆیەوە جۆری مامەڵەکە لە ئاستی (کەس - کەس) بچێتە ئاستی (کۆمپانیا- کەس)ەوە.

٣- دەتوانرێ بە جۆرێکی جیاواز لەو جۆرە تەقلیدییە، ئیدارەی کاری دابەشکردن بکرێت، ئەویش دوای جێبەجێکردنی خاڵی یەکەم، بەشێکی سەربەخۆ ئیدارەی دابەشکردن بکات، هەموو داواکارییەکان بگاتەوە ئەو بەشەو لەوێوە بگاتەوە یەکەکانی دابەشکردن‌و هەر داوایەك ئاراستەی ئەو یەکەیە بکرێت کە لەو کاتەدا نزیکە لە شوێنی ئەو مارکێتەوە کە داواکارییەکەی ناردووە، لەم حاڵەتەدا کارمەندی دابەشکردن دەبێتە کەسێکی جێبەجێکار کە تەنها کاڵاو پسوڵە دەبەخشێ‌و پارە وەردەگرێت. بەڵام ئەو کاتە بەدەمەوەچوونی کرێکارەکان‌و گوێگرتن لێیان دەکەوێتە ئەستۆی بەشی دابەشکردن واتە بە شێوازی مەرکەزی مامەڵەی کریارەکان رێك دەخرێ.

٤- کردنەوەی دەرگای فرۆشتن بەرووی ئەو کەسانەدا کە خۆیان کاری دابەشکردن دەکەن، واتە کارمەندی هیچ کۆمپانیایەك نین، ئەمە وادەکات کە ئەرکی سەرشانی بەشی دابەشکردن کەم بکاتەوەو هاوکات بڵاو بوونەوەیەکی زیاترە بە بازارداو لە لایەکی تریشەوە گشت هێلکەکانی (خوان) ناکرێنە یەك سەبەتەوە.

٥- لێکۆڵینەوەو بەدواداچونی ئەو هۆکارانەی وایکردووە لە کارمەندەکان کە واز لە (خوان) بهێنن، دواجار بۆچی دەچنە کۆمپانیایەکی ترو لەوێ هەمان کاری دابەشکردن دەکەن؟ پێ دەچێت کێشەی ئەوان تەنها موچە نەبێت، لەوانەیە کێشەیەکی مەعنەوییان هەبێت لەگەڵ ئیدارەدا.

ئەم خاڵانەی خرانە روو چەندین خاڵی تریش هەموویان چارەسەرن بۆ ئەو کێشەیە، بەڵام چارەسەر لە رووکەشدا، چارەسەری جەوهەری پەیوەستە بەسیستەمی کارکردنی کۆمپانیاوە، کاتێك ئەدای کۆمپانیاکە لەرووی کوالێتییەوە بەرز بکرێتەوە، ئەمە چارەسەرە. بەرزکردنەوەی جەودەی ئەدای (خوان) دەبێتە هۆکاری سەرەکی بۆ دوورکەوتنەوەی کۆمپانیا لەو کێشانە. دواجار جەودە گەر بووە ستونێکی سەرەکی لە سیستەمی ئیدارەی کۆمپانیادا، ئەوا هەر کارمەندو فەرمانبەرێك کە دێتە دەرەوەی ئەو سیستەمە ناتوانێت هەمان ئەدای هەبێت وەك ئەوەی کە لەناو سیستەمەکەدا توانیویەتی بیکات.

کەواتە یەکەم هەنگاو بۆ دوورکەوتنەوە لەو کێشانە بریتییە لە رێکخستنی ناوماڵی کۆمپانیا بەجۆرێك کە جەودە لە ئەدای کۆمپانیادا سیمای کارەکانی بێت، ئەم پرۆژەیە (کارو کات‌و پارە)ی دەوێت بەڵام کۆمپانیا لە مۆدێلی کلاسیکەوە دەباتە مۆدێلێکی مۆدێرن‌و لە روانگەیەکی فراوانەوە کێشەکانی دەبینێ.

د. ستیفن ستراڵسر (مامۆستای کۆلێژی یارڤین بۆ کارگێری نێودەوڵەتی‌و بەرێوەبەری ئیدارەی سەنتەری جیهانی بۆ کارگێری) دەڵێت: (کاتێك جەودە دەبێتە بنەمای سەرکەوتنی هەر کۆمپانیایەك ئەوا سیستەمەکانی کارگێری جەودە دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە کۆمپانیاکە لە ئاستە باڵاکانی جەودەدا بمێنێتەوەو بەڵێنەکانی لەو ئاستەدا جێبەجێ بکات).

دروستکردنی ئەو سیستەمە بۆ (خوان)و هاوپیشەکانی خاڵی هێزو بردنەوەیە، چۆنیەتی دروستکردن‌و پاشان جێبەجێکردنی پرەنسیپەکانی جەودە دەبێت (سر المهنه) بۆ (خوان) کە لەوانەیە هاوپیشەکانی نەتوانن زوو بیدۆزنەوە. بۆیە هەلە بۆ ئەو جۆرە کۆمپانیایانە، بە تایبەتیش کە ئاستی بەکاربەران‌و شێوازی شانکی کردن لای ئێمە نەگەیشتۆتە ئاستێك کە کارکردن تێیدا مەحاڵ بێت.



# هۆیەکانی گرنگیدان بە زانینی بازاڕسازی

بەشی سێیەم

م. هاژە شێروانی

١- پاڵنەری ڕێکخراو بۆ بازرگانی جیهانی:- کاتێك کە پاڵنەری ڕێکخراو زیاد دەکات بۆ بازرگانی جیهانی توانای زانینی بازاڕسازی زیاد دەکات (زانینی کڕیار، زانینی بەرهەم، زانینی دابینکەر، زانینی ڕکابەر) بۆ پاڵپشتی کردنی ڕێکخراو بۆ چوونە نێو بازارە نوێیەکان.

٢- ئاراستەی کارگێڕی باڵا بۆ کۆنترۆڵ کردنی بازاڕ:- کاتێك کە ئاراستەی کارگێڕی باڵا زیاد دەکات بۆ کۆنترۆڵ کردنی بازاڕ گرنگی زانینی بازاڕسازیش زیاد دەکات لە دەستخستنی زانیاری پێویست لە سەر بازاڕ.

٣- هەرەمی ڕێکخستن لە چوارچێوەی ڕێکخراو:- کاتێك کە گرنگیدان بە هەرەمی ڕێکخستن زیاد دەکات توانای زانینی بازاڕسازیش زیاد دەکات لە پڕکردنەوەی زانیاری پێویست.

٤- ناسینەوەی بازاڕی ڕێکخراو:- تاوەکو ناسینی کێبەرکێی ڕێکخراو زیاد بکات پێویستی بوون بە زانینی بازاڕسازی زیاد دەکات.

٥- ئەدای ستراتیژی ڕێکخراو:- تاوەکو ئەدای ستراتیژی ڕێکخراو زیاد بکات گرنگی زانینی بازاڕسازی زیاد دەکات لە دابینکردنی داتا زانیاری پێویست لە سەر ئەو بازاڕانەی کە ڕێکخراو کاری تیادا دەکات.

٦- چڕوپڕی ڕکابەری کردن لە نێوان ڕێکخراوەکان:- چڕوپڕی ڕکابەری کردن کاردەکات بۆ زیادبوونی گرنگی زانینی بازاڕسازی بۆ ڕێکخراوە ڕکابەرەکان.

گرنگی زانینی بازاڕسازی/

١- زانینێکی باش لە سەر کڕیار کاردەکات بۆ زیادبوونی شارەزایی ڕێکخراو لە پەرەپێدانی بەرهەمی نوێ، ئەمەش لە ڕێگای ئەو داتاو زانیارییەی کە زانینی بازاڕسازی پێشکەشی دەکات لە سەر پێداویستیو ئارەزووی کڕیار کە ڕێکخراو دەتوانێ بەگەڕیان بخات لە بەرهەمهێنانی بەرهەمی نوێ.

٢- زانینێکی باش لە سەر بەرهەمەکانی ڕێکخراوی بازاڕ، کاردەکات بۆ کەمکردنەوەی هەڵەکانو ئەو جارانەی کە ڕێکخراو تیایدا تووشی مەترسی بەرهەم هێنان دەبێتەوە.

٣- لە ڕێگای زانینی بازاڕسازی بە شیکارانو لێکۆڵینەوە دەتوانێت بەرهەمێك بخاتە بەردەست کە کوالێتی بەرز بێت.

٤- زانینی تایبەتمەندیو تواناو ناسینەوەکانی دابینکەران، وا لە ڕێکخراو دەکات لە بارێکی باش بێت لە کاتی دابینکردنی کەرەستەی سەرەتایی بۆی.

٥- زانینو تێگەیشتنی سروشتی کارو ستراتیژییەکانی ڕکابەران، وێناکردنی داهاتوو دەخاتە بەردەستی ڕێکخراو بۆ جووڵە پێشبینی کراوەکانی ڕکابەران.

٦- زانینی بازاڕسازی ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە چاککردنو ڕێککردن، کە لە ژێر ڕۆشنایی ئەوەدا ڕێکخراو دەتوانێت هەڵسێ بە پشکنینێکی گشتی بۆ هێزی کارو دیاریکردنی کەلێنی هەبوو و هەروەها ئاستەکانی کارزانیو دابینکردنی تەکنەلۆژیاو سروشتی کاری ڕێکخراو لە داهاتوو.

٧- بوونی پێویستیەك بۆ زیاتر بوونی زانین سەبارەت بە پێشبینی دانیشتوان ئەگەر ڕێکخراو هەڵسا بە ڕاپەڕاندنی ئەرکە ئابووریو کۆمەڵایەتییەکانی.

٨- ڕێکخراو پێویستی بە زانینی بازاڕسازی هەیە بە مەبەستی تێگەیشتنی باشتر لە تایبەتمەندی بەرهەمەکانو بەراووردکردنی بە پێوانە جیهانییەکان.

٩- زیادبوونی توندی ڕکابەری کردن لە بازاڕەکانو خێرایی زۆربوونی داهێنانەکانو دۆزینەوە نوێیەکان بوو بە هۆی سەرهەڵدانی ڕێکخراوی پێشڕەوی کار لە بازاڕ، هەربۆیە پێویستە لە سەر ڕێکخراوەکانی تر کە خاڵەکانی ڕکابەری کردن بە هەند وەربگرێ کە ئەو ڕێکخراوانە بە سەریدا دەسەپێنن.

١٠- ڕکابەری کردنی نێوان ڕێکخراوەکان لە ئێستادا لە سەر ئەو زانینەیە کە هەر ڕێکخراوێك هەیەتی.

١١- ئاڵۆزییەکانی کاڵاو خزمەتگوزاری پێویستی بە زانینی زۆرتر هەیە لە سەر کڕیار، ڕکابەر، بەرهەم.... هتد.

بنەماکانی زانینی بازاڕسازی:

لێرەدا گەلێك بنەما هەن بۆ زانینی بازاڕسازی کە بریتین لە:

١- زانینی بازاڕسازی زۆری تێدەچێت، لەبەر جۆراوجۆری سەرچاوەکانی.

٢- زانینی بازاڕسازی پێویستی بە بەڕێوەبەرانێك هەیە کە درك پێکراو و بە ئاگابن لە زانین.

٣- کارگێڕی ڕێکخراو بە پلەیەکی گەورە سوودمەندە لە زانیاری وەرگیراو لە سەر بازاڕەکان زیاتر لەوەی کە وەریدەگرێ لە پلەکانی پیشەکەی لە نێوخۆی ڕێکخراو.

٤- زانینی بازاڕسازی بە واتای چاکسازی پرۆسەکانی کارکردن.

٥- گەیشتن بە زانین بە سەرەتای ڕێگا دادەنرێت، چونکە زانینی بازاڕسازی بەردەوامو پەرەپێدراوە.

٦- زانینی بازاڕسازی بە هێزی ڕێکخراو دادەنرێت.

٧- تەنها چارەسەر نییە بۆ بارەکانی زانینی بازاڕسازی، چونکە زانینی بازاڕسازی بەردەوام لە گۆڕانکاریدایە.

٨- زانینی بازاڕسازی تا سەر لە گەشەدا نییە، چونکە لە بارێکدا هەندێك زانینی بازاڕسازی ون دەبێت بەتەواوی وەکو ئەو شتانەی کە لە سروشت ون دەبنو گرنگی نەدان بە جۆرەکانی زانینی بازاڕسازی دەبێتە هۆی گەڕانەوەی کۆمەڵێك زانینی تەواو لە سەر بازاڕەکانو بەمەش دەرفەتی گەشەسەندنو پەرەپێدان لەم بازاڕە کەم دەبێتەوە.

٩- بەرپرسیارییەتی پێشکەوتنی زانینی بازاڕسازی بە تەنها ناکەوێتە سەرشانی یەك کەس، بەڵکو هەموو کەسەکانی ناوخۆی ڕێکخراو بەرپرسن لە پەرەپێدانی.

١٠- چۆنیەتی ناسینی زانینی بازاڕسازی ئەو ڕێگایە دەستنیشان دەکات کە بەڕێوەی دەبات.



# فێرکردن ڕێگاچارەی ستراتیژییە؟

و/ئەمیر ئەحمەد عبدالقادر

بێگومــان گرنگــیو بایەخــی فێرکــردن مەسەلەیەکە ئەمڕۆ لە هەر ناوچەیەکی جیهان جێگەی مشــتومڕە، ئەزموونە نێودەوڵەتییە هاوچەرخەکان سەلماندوییانە کە هیچ بوارێك بــۆ گومــان ناهێڵێتــەوە کە ســەرەتای پێش کەوتنی راســتەقینە بەڵکو تاکە ڕێگە بریتییە لە فێرکردنو فێرکردن دەروازەی پێشکەوتنی وڵاتە پێشــکەوتووەکان بــووە، هەر بۆیە وڵاتە پێشــکەوتووەکان فێرکــردن لــە کارەکانــی پێشەوەی پرۆگرامو سیاسەتەکانیان دادەنێن.

فێرکــردن بریتییــە لــە ســتراتیژییە نەتەوەییــە مەزنــەکان وڵاتانــی جیهانــی پێشــکەوتوو و خەڵك وەکو یــەك ئەوەش بە هۆی ئەمەوە کە ئەم وڵاتانە هەستیان بە ڕۆڵی بەرچــاوی فێرکردن کردووە لە پرۆســەکانی پەرەپێدانی سیاســیو ئابــوریو کۆمەڵایەتی تەنانــەت بەشــداریکردنی راســتەقینەی لە هێنانــەدی ئاســایش بۆ گــەلانو دابینکردنی ئارامــیو خــۆش گوزەرانــی بۆ یــانو بەرەو پێــش چونیان. فێرکردن بۆتە پێویســتییەك لــە پێویســتییەکانی ژیــان نــەك بــە تەنها خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی بۆتە بنچینەیەکی گرنگ لە بنچینەکانی رۆشــنبیریو شارستانی لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکانو ئەو ســەردەمەی تیایدا دەژین کە گۆڕانکاریو ڕووداو و شۆڕشی رۆشــنبیری بەردەوامە کەســی نەخوێندەوار ئەســتەمە شــان بە شــانی بڕواو لەگەڵ ئەم گۆڕانکاریو داواکاریانەی سەردەم هەڵ بکات.

لە راســتیدا ئەگــەر چاوێك بــە چەمکی پەرەپێدان بخشێنین دەبینین کە ئەو چەمکە دەربرینێکی مەعنەوییەو مانای پرۆسەیەکی دینامیکــی پێکهاتووە لــە زنجیرەیەك گۆڕانی ئەرکــیو بینایی پێویســت بۆ مانــەوەی هەر بونەوەرێکــی زینــدو و گەشــەکردنی لــە ژینگەکەیــداو بــۆ جێبەجێکردنــی چەمکی پەرەپێدانی بونەوەری زیندو لەســەر کۆمەڵگا دەتوانرێت دەستەواژەی پەرەپێدان بەم جۆرە لێکبدرێتەوە کە نیشانەی ڕوودانی زنجیرەیەك گۆڕانــی ئەرکــیو بیناییــە بۆ گەشــەکردنی کۆمەڵگا ئەوەش بە زیادکردنی توانای تاکەکانی لەســەر بەکاربردنی وزە دەست هاتووەکان لە کۆمەڵگــا تا ئەو پــەری تواناو بە شــێوازێکی ئەوتۆ ئامانجەکانی بهێنێتە دی (١، ل ٨٧).

ئەمــەو توێژینــەوە تایبەتمەنــدەکان ســەلماندویانە ڕۆڵی رەگەزی کار لە پرۆســەی بەرهــەم هێنــان زیاتــر دەبــێ لــە میانەی زیادکردنــی بەرهــەم هێنان بــە پێی چەند نیشــانەیەکی جیــاواز، لــە گرنگترینــی ئەم نیشانانەش فێرکردنو مەشق کردنە، فێرکردن بە چەشنە جیاوازەکانیو ئاستو قۆناغەکانی بە پایەیەکی سەرەکی دەژمێردرێ لە پایەکانی پەرە پێدانی داهاتە مرۆییەکان، توێژینەوەکان دەریــان خســتووە ئــەو کرێــکارەی خاوەنی بڕوانامەی باڵایە بە ڕێژەی ٧٥٪ ســەرکەوتوو تــرە لــە هاوەڵەکەی کــە خــاوەن بڕوانامەی دواناوەندییــەو ئەویــش بە ڕێــژەی ٤٥٪ لە هاوەڵەکەی ســەرکەوتوو ترە، ئەوەشی خاوەن بڕوانامەی خوار دواناوەندییە بە ڕێژەی ٢٥٪ لە هاوەڵەکەی سەرکەوتوو ترە لە بەرهەم هێنانی کارەکەیــدا (٢، ل ١٢). بــەڵام لێکۆڵینەوەکانی (شــولتزو دینســونو ماری بومانو بیکر) لە ویلایەتــە یەکگرتووەکانــی ئەمریــکا دەریان خســتووە کە بەهای وەبەرهێنان لە مرۆڤ دا لــە چ ئاســتێکدایە، لــە ئەنجامەکانی یەکێك لــەم لێکۆڵینەوانەدا هاتــووە کە (٣٦٪: ٧٠٪)ی زیــادەی داهاتــی نەتەوەیی لە مــاوەی ١٩٢٩:

١٩٥٧ دەگەڕێتەوە بۆ فێرکردنی کرێکارەکان، هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی دیکە ئاماژە دەکات کە ٥٠٪ ی زیادەی داهاتی نەتەوەیی لەساڵانی ١٩١١ - ١٩٦١ دەگەڕێتەوە بۆ باش بوونی ئاستی فێرکردن، ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەیەکی تر لێکۆڵینەوەکەی پێشتری پتەوتر کرد کە دەڵێت: فێرکردن بە ڕێژەی ٤٢٪ هاوکاری زیاد بوونی داهاتی نەتەوەیی کردووە.

لەمەوەو لە روانگەی گرنگترین پێداویستییەکانی پەرەپێدانی ئابوری بوونی هێزی مرۆیی پێویستە بۆی کە شارەزایی ژیری و کردارییان پێویستە، ئنجا ئاراستە هاوچەرخەکانی پەرەپێدانی ئابوری لەسەر زیادبوونی توانای تاکەکان لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئامێر لەلایەکەوەو بەدەست هێنانی ئاراستە راستو گونجاوەکان بەرەو کارو هەست بە بەرپرسیارێتی کردن لە لایەن تاك لە لایەکی ترەوە وەستاوە، هەروەها پەرەپێدانی ئابوری پێویستی بە بوونی ئاراستەی دروستە رووەو وەبەرهێنانو پاشەکەوت کردنو ڕێکخستنی بەکار بردنو لە هەموو ئەم کارانەش دەبینین کە دامەزراوەکانی فێرکردن رۆڵێکی گرنگیان هەیە لە پاڵپشتی کردنو پەرەپێدانیدا.

بێگومان بەبێ پەروەردە نە زانیاری دەبێو نە تواناو شارەزایی، نە گیانی کارکردنی بەرهەم هێن، نە ڕێکخستنی وزەی مرۆیی بۆیە هەر وڵاتێك پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینیبێ یەکەم کاری پەروەردە بووە، لەمەوە دڵنیا دەبین کە پێشکەوتنی خوازراو پێویستی بە بایەخدان بە فێرکردن هەیە لە رووی چەندێتیو چۆنیەتییەوە، پشت بەستن بە یەکێك لە رەگەزە بنچینەییەکانی پەرەپێدان، سەرمایەی مادی یاخود سەرمایەی مرۆیی بە بێ شتی تر کاریگەری لەسەر توانای کۆمەڵگا دەبێت بۆ گەشەکردن.

فێرکردن بەرپرسیارێتییەکی زۆری لەسەرە لە هێنانەدی پەرەپێدان، کە پەرەپێدانی گشتگیر خوازیارییەتی، پەرەپێدان بە مانا فراوانەکەی کە سەرجەم جۆرەکانی ژیانی پەرەپێدانی مرۆیی دەگرێتەوە بە هەموو ئەو دۆزینەوەو سەرپەرشتی کردنو پاڵپشتی کردنو مەزن کردنی هێزە مرۆییەکانو پسپۆڕیو تواناکانی ئادەمیزادو ئاراستەکردنیان بۆ خزمەت کردنی ئەو مرۆڤە خۆیو لە چوارچێوەی ئەو کۆمەڵگایەی تیایدا دەژی، هەروەها پەرەپێدان پەرەپێدانی ئابوریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیریش دەگرێتەوەو هەموو شتێك پاڵپشتی چالاکییە هەمە جۆرەکانیان بکات لە ماددیو مرۆیی، ئەگەر سەیری ئەزموونە مرۆییەکان بکەین کە لە سەردەمەکانی پێشوو بوونو پێشکەوتنی بەرچاویان بەدی هێناوە لە هەموو ئەو بوارانە لە رۆژهەڵاتو رۆژئاوا بە هەند وەرگیراون، دەبینی لە دەروازەی فێربوونەوە ئەنجام دراون. ئەگەر تەماشای وڵاتە زلهێزەکان بکەین کە ئەمرۆ ململانێ لەسەر پێشکەوتن دەکەن، دەبینین بەردەوام سیستمی فێرکردنیان بەرەو پێش دەبەنو هەوڵ دەدەن لە سیستمی فێرکردنی وڵاتانی تر بکۆڵنەوەو هەموو هەوڵو توانایەکیان بۆ بەرەو پێشبردنی فێرکردن خستۆتە گەر.

لە ئینگلتەرا لێکۆڵینەوەی گۆردن کینیجها پێداگری کردووە لەسەر ئەوە کە پەرەپێدانی سامانی مرۆیی لە ڕێگەی فێرکردنەوە گەورەترین کاردانەوەی ئابوری هەیە، هەروەها توێژینەوەی مارگریت تاتشر دوپاتی کردەوە لەسەر بایەخی پێداچوونەوەی بەردەوام بۆ سیستمی فێرکردن لە بەریتانیا بۆ ئەوەی شان بە شانی پەرەسەندنەکانی سەرجەم بڕوات لە بواری زانستو تەکنەلۆژیادا.

هەروەها تۆنی بلێری سەرەك وەزیری پێشووی بەریتانیا دووپاتی کردەوە کە دەبێ بایەخ بە فێرکردن بدرێ، ئەو بە درێژایی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکان دووبارەی دەکردەوە هەمیشە لە کارە پێشینەکانی بەرنامەی حکومەت پرسیارم لێ دەکەن کە بریتییە لە فێرکردن، فێرکردن، فێرکردن.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش شۆڕشێکی فێرکردنو پێداچوونەوەیەکی گشتگیری سیستمی فێرکردن لە ساڵی ١٩٥٧ ی زایینی رووی دا، ئەمەش لەو کاتەدا بوو کە رووسیا یەکەمین مانگی دەسکردی رەوانەی بۆشایی ئاسمان کرد، لە ساڵی ١٩٨٣ی زایینی ریگانی سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا راپۆرتە بەناو بانگەکەی بڵاوکردەوە (گەل لە پلانێکدا)، ئنجا بۆش بەدوای ئەو گرنگی زۆری بە فێرکردن داو بەرنامەی کاری بریتی بوو لە (گەلێك لە خوێندکاران)، ئنجا بەم دواییە راپۆرتێکی تری (بۆش W) دەرچوو گەل تاکو ئێستاش لە پلان دایە لە هەموو ئەوانەوە دەبینین کە ویلایەتە یەکگرتووەکان زۆر بایەخی بە پرۆسەی فێرکردن داوە زیاتر لەو بایەخەی بە کارگەکانو شتی تر دەیدات.

لە لێدوانێکی دا بۆ تەلەفزیۆنی ئیسرائیلی شەمعۆن پیرێز ئاماژەی کرد بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی بەهێزی جولەکەو وتی: (ئەگەر لە دەوروبەرمان وڵاتانێك هەبن ئایینی ئیسلام پەیرەو دەکەنو خاوەنی سامانی سروشتیو پترۆڵن، ئەوا ئێمە دەتوانین ململانێکە بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل یەکلایی بکەینەوە، ئەویش لە ڕێگەی (فێرکردنو ڕێگەی سامانی مرۆیی راهێنراو) کە لە دەستماندایە، هەروەها رەخساندنی بواری فێرکردنی باڵاو زانکۆکان بۆ هەموو کورو کچێکی ئیسرائیلی بە جۆرێك لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەم بگونجێت.

ئەگەر ئەمرۆ نەتەوەی عەرەبی رووبەرووی چەندین پێشهاتی نێودەوڵەتیو ئیقلیمیو ناوخۆیی دەبێتەوە کە وادەکەن پێشخستنی فێرکردن ڕێگە چارەیەکی ستراتیژی بێتو هیچ ئەلتەرناتیفی نەبێت، نیشتمانی عەرەبی دوورە پەرێز لە وڵاتانی تری جیهان ناژی، بەڵکو بە کراوەیی بە رووی هەموو جیهاندا دەژی بەو کەلەپورە رۆشنبیریو شارستانییەی هەیەتی دەتوانێت لە رۆشنبیرییەکانی جیهان بەهرەمەند بێتو لەگەڵ گۆڕانکارییەکان خۆی بسازێنێ، بێگومان پێشکەوتنی فێرکردن لە نیشتمانی عەرەبی لە رووی شێوەو ناوەرۆکەوە رووکارە بنچینەییەکانی لە سروشتی گۆڕانکارییە ناوخۆییو نێودەوڵەتییەکانەوە وەردەگرێ کە رووبەرووی نیشتمانی عەرەبی دەبنەوە هەر لە رۆژهەڵاتیەوە تاکو رۆژئاوا.

بەڵام ئەو نەهامەتییەی سەرجەم وڵاتانی عەرەبی تیایدا دەژین ئەوەیە لە کاتێکدا خاوەنی داهاتی ئابوریو توانستی ماددی زۆرن سەرەرای کەلەپورێکی شارستانی رەسەن، بوونی هۆکاری مەدەنی هاوچەرخ، ئەوا تێکرای رۆڵەکانی ئاستی رۆشنبیری نزمیان بەرز ناکەنەوە بۆ وەبەرهێنانی ئەم داهاتوو کەلە پورو توانستەکان کە پاڵیان بنێت بەرەو ڕێگەی پێشکەوتن بە خێرایی خوازراو.

بێگومان زۆرێك لە وڵاتە عەرەبیەکان دەستیان کردووە بە پێداچوونەوەی سیستمی فێرکردنیان بە جۆرێك لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەم بگونجێت، لەمیسرو ئوردن هەندێك چاکسازیو نوێ کردنەوەی فێرکردن ئەنجام دراوە، هەروەها لە چەند وڵاتێکی تریش، تا وەکو بۆ جیهان بسەلمێت کە نیشتمانێکمان هەیە خاوەن شارستانییەتو مێژوو و رەسەنایەتییە، نەك وەکو ئەوەی (حاییم وایزمان) دەڵێت: ئێمە هاوار دەکەینو ناگەزین، بەڵام ئێمە بۆی دەسەلمێنین کە ئێمە هاوار ناکەین و ناگەزین بەڵکو لەگەردنەکان دەدەینو ئەو شمشێرەی بەکاریشی دێنین بریتییە لە فێرکردن، تۆ بڵێی ئەو وتەیە نەتەوەکانی رۆژهەڵاتی ناوەند بێدار بکاتەوە لەو بێ ئاگاییەی دەمێکە پەکی خستووەو لەو پارچە پارچە بوونەوەی لاوازی کردووەو لەژێر یەك ئاڵا کۆببنەوە؟ هیوادارم.

به پێنوسی / دکتور عنتر عبدالعال.



# ئەنفلۆنزای ژیری!

جۆرێکی تر لـە ئەنفلۆنزا، پێی دەوترێت ئەنفلۆنزای ژیری ئەمەش لە ڕێگای ئەو ڤایرۆسەی کە پەردەکانی مۆخ تێدەپەڕێنیّو گیری دەکاتو چوار دەوری دەدات، ڤایرۆسێکی زۆر بەهێزە، زۆر بە داخەوە تا ئێستا هیچ دەرمانێکی پزیشکی نەیتوانیووە چارەسەری ئەم ڤایرۆسە بکات... هیچ شتێك ناتوانێت بەری پێبگرێت.

ئەو ڤایرۆسەی کە لە نێوان زۆربەی خەڵکی بڵاوبۆتەوە.... ڤایرۆسێکە دژی هەموو شتێکی نویّو داهێنەرانەیە... ڤایرۆسێکە ئایدیاکان دەکوژێتو دەوری ژیری دەدات بە تاریکیو نەزانی... لێرەدا هەندێك لەو وتانەی کە دەربارەی ژیری وتراوە دەخەینە ڕوو، پاشان گرنگترین نیشانەکانی ئەم ڤایرۆسە دەخەینە بەرچاو:

* ناتوانیت باڵندەی خەم قەدەغە بکەیت کە بە سەر سەرتەوە بسوڕێتەوە، بەڵام دەتوانی کە ڕێگای لێبگریت کە سەرت کون نەکات.

* ژیری وەکو پەڕەشووتی فرۆکەوان وایە سوودی نابێت تا نەکرێتەوە.

* ئەگەر مرۆڤ ژیری بەکارنەهێنێت کاتێکی زۆری بە سەر تێناپەڕێت تا هیچ ژیری نەدۆزێتەوە بە کاری بهێنێت.

* ژیری بچوك وتوێژ لەگەڵ کەسەکان دەکات، ژیری مامناوەند وتوێژ لە سەر شتەکان دەکات، بەڵام ژیرە گەورەکان وتوێژ لەگەڵ بنەماکان دەکات.

* ژیری دەرمانخانەیەکی جووڵاوە، کۆگایەکی دەرمانە کە بە بەردەوام لەگەڵ خۆتدا دەیهێنیتو دەیبەیت کە بۆ هەر شوێنێك بچیت لە گەڵتە.

ئێستاش گرنگترین نیشانەکانی ئەنفلۆنزای ژیری دەخەینە ڕوو:

١- ژیری تەماوی:- ئەم توش بووە چاکەو خراپە لە خۆی جیاناکاتەوە، لە ژیانیدا تێکەڵیو ئاڵۆزییەك دەبینرێت، کە نازانێت چی دەوێتو چی ناوێت؟ تەنها مەبەستییەتی کە جێ پەنجەی هەبێت ئەگەر بە نەفرەت یا هەر جۆرێکی تر بێت، ئامانجێکی ڕوونی نییە، نە نەخشەیەك بۆ ڕێگاو ڕێچکەیەك بۆ کار کردن، بەڵکو تەنها لە جیهانێك دەژیت کە جیهانێکە لە دەرەوەی جیهانی پێشینەکانیشە.

٢- تێکشکاو و دوودڵو شکست خواردوو:- ئەم ژیرییە هەمیشە گرەو لە سەر سەرنەکەوتنو سەرنەکەوتنی هەمووان دەکات، خاوەنی ئەم ژیرییە لە چوارچێوەیەکی تێکشکاوو دوودڵو شکست خواردوو دەژیتو بانگی خەڵك دەکات بۆ جیهانەکەی... توانای نییە هیچ شتێك دروست بکاتو نایەوێت کەسیش هیچ شتێك دروست بکات... بە کارزانییەك دەتوانێت لە زەریای شکستو تێکشکاوی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ مەلە بکات بە بێ ئەوەی کە بێزار بێت.

٣- ژیرییە سەراو ژێرەکان: بیهێنە بەر چاوت کەسێك قاچەکانی بۆ سەرەوەو سەری بۆ خوارەوە بێت!!! پێشبینی دەکەیت چی ببینێت؟!! بە بێگومان تەنها شتی سەراوژێرو هەڵگەراو دەبینێت!!! ئاساییە کە کەسانێك هەبن کە خاوەن ژیرییەکی شکست خواردوو و سەراوژێربوو بنو لەبەر چاویان

سەرکەوتنەکان بە شکست ببینن و ناوی سەیرو سەمەرەشی لێبنێن و بە شێوەیەك دەروانن کارەکان کە پێچەوانەی مرۆڤە ژیرەکانەو لە خەیاڵی ئەواندا هەموو کارێکی سەرکەوتوو بە شکست دەزانن و هۆکارەشی روون و ئاشکرایە.... بیرکردنەوەیان خراپە خۆیان لە گۆشەیەك گیرکردووەو بە هیچ شێوەیەك هیوایان بە دەرچوون نییە!!! ژیرییان سەراو ژێرەو شەوو رۆژیان دیار نییەو ئەستێرەکانیش لە لایان تەنها گلۆپێکی رووناکی دەرەو پێویستیان پێی نییە.

٤- راوی هەڵەکان: ئەم ژیرییەش هەروەکو موگناتیس بەرەو لای هەڵەکان کێش دەکرێت کە تەنها وردە ئاسن کۆدەکاتەوەو هەرگیز ناچێت بە لای گەوهەرو زێرو زیودا... خاوەنی ئەم جۆرە ژیرییانە سەیری داهێنانەکان و بەرهەمەکان و سەرکەوتنەکانیان ناکەن، بەڵکو تەنها بە شوێن هەڵەکانیانەوەن.

٥- ئێرەیی پێبردن: ئەمەش لە مەترسیدارترین جۆرەکانی ئەنفلۆنزای ژیرییە کە بەرهەڵستی سەرکەوتن دەکات و هەمیشەش خاوەنی پەیامێکە کە دەڵێت ئەگەر من لە پێشڕەویدا نەبووم نابێ تۆش ببیت و هەرگیز بەسەرکەوتنی تۆ قایل نابم... ئەمەش هەمووی لە دەرەنجانی ئێرەیی و حەسوودی پێ بردنە!!! ئەم جۆرە ژیرییە بە جۆرێك ڤایرۆسەکە کاری تێکردووە کە وادەی بە سەرناچێت، دان بە هیچ سەرکەوتنێك دا نانێت ئەگەر ئەو شوێن پەنجەی تێدا نەبوو یا هۆکارێك نەبوو تیایداو پێویستیش ناکات کە قسەی لە بارەوە بکات.

٦- دوژمنی سەرکەوتن: ئەم جۆرە کەسانە هەرگیز دەستخۆشی لە سەرکەوتووان ناکەن و پشتگیرییان ناکەن و هەر کات کە کارێکیان بینی تەنها دەڵێن کە ئەگەر وا بوایە وا دەبوو و ئەگەر وات بکردایە وادەبوو، باشتر نەبوو وا نەبێت... ئەو دوژمنی سەرسەختی سەرکەوتنەو تەنها کاری رەخنە گرتنە کە لە ئاستی کارەکە کەم بکاتەوە! هەموو کات خاوەنی بیروبۆچوونێکە کە زۆر جیاواز ترە لە کەسانی تر، هەموو کات دژی ئاراستەی بایە، ئەم جۆرە کەسانەشمان هەمیشە لە کۆمەڵگا بەرچاو دەکەوێت، لە بنەرەتیشدا ئەمان دوژمنی خوودی خۆیانن بە بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن.

لە کۆتایی بابەتەکەشم هیوادارم کە تۆی خوێنەری بەرێز بە دوور بیت لەم جۆرە ڤایرۆسانە، ئەگەر تووش بوویت بە یەکێك لەمانە دڵنیابە کە دەتوانی چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزیتەوەو بە بێگومانیش دەزانی چارەسەرەکەی چییە؟

# چۆن زاڵ ببین بەسەر هاوکارە نێگەتیڤەکانماندا؟

و: مودریک عەلی عارف

هەر یەکێك لە ئێمە ئەزموونی رووبەروو بوونەوەمان لەگەڵ هاوکارانی نێگەتیڤ و مەنفیدا هەیە، ئەو جۆرە هاوکارانە گلەیی و گازندە لە هەموو شتەکان دەکەن، ئەگەر گلەیی و گازندەکەیان پەیوەست نەبێت بە رێژەی کار یاخود کاروباری فەرمانگەو نوسینگەکەیانەوە، ئەوا بەحەتمی پەیوەندی دەبێت بە خواردنی کافتریاکەیانەوە، یاخود پەیوەندی دەبێت بە شتێکەوە کە لە ژیانی تایبەتی خۆیاندایە.

ئەو گلەیی و گازندەو سکاڵایانە پەیوەندییان بە هەر شتێکەوە هەبێت ئەوا ئەم رێگە چارەو دەستپێشخەرییانەی خوارەوە پێنج رێگەو شێوازی دڵنیاکەرەوەن کە یارمەتیت دەدەن زاڵ ببیت بەسەر هاوکارە نێگەتیڤ و بۆڵە بۆڵکەرەکانتدا:

هەنگاوی یەکەم/ بیر لە بۆچوونە پۆزەتیڤەکان بکەرەوە:

چونکە هاوکارێکی نێگەتیڤ دەتوانێ رۆژو رۆژگارت تێکبدات و خراپی بکات، باشترین بەرگریی لە رووبەروبوونەوە لەگەڵ کەسانی لەم شێوەیەدا، بیر کردنەوەیە لە بۆچوونە پۆزەتیڤەکان.

لەو سۆنگەیەوە کە تۆ دەزانیت هاوکارەکەت لە گلەیی و گازندەکردندا پێشینەیەکی دێرینی هەیەو هەمیشەو بەردەوام تەماشای نیوەی خاڵی پەرداخەکە دەکات، ئەوا دەکرێت کە تۆ هەنگاوێك بچیتە پێشترو سەرووترەوەو بیر لە ئاوابوونی خۆرو کەناری دەریا بکەیتەوە.

هەنگاوی دووەم/ بۆڵە بۆڵ و بەدبینییەکانی ئەوان بشکێنەوە بە لای بەرژەوەندییەکانی خۆتدا:

هاوکارێکی بەدبین دەتوانێت بە شێوەیەکی سادەو ساکار چیایەك لە خاك دروست بکات.

ئەگەر ئەندازەو قەبارەی کارەکە قورس و سەنگین بێت، ئەوا دەتوانیت گرەنتی ئەوە بکەیت کە ئەو یەکەمین کەس دەبێت کە گلەیی و گازندە دەکات.

چاکترین شێوازیش بۆ ئەوەی زاڵ ببیت بەسەر کەسێکدا کە هەمیشەو بەردەوام خەریکی گلەیی و گازندەکردنە، بریتییە لەوەی کە بۆڵە بۆڵ و بەدبینییەکانی ئەو بەلای بەرژەوەندییەکانی خۆتدا بشکێنیتەوە.

لەو سۆنگەیەوە کە تۆ بە راستی بۆ ئەوەی کە ئیش و کار بکەیت هاتوویتەتە سەر پیشەو کار، کەوابوو ئێستا دەزانیت کە خەڵکی چ جۆرە چاوەروانییەکیان لێت هەیە؟

هەنگاوی سێهەم/ پشوویەك بدە:

ئەگەر هاوکارە نێگەتیڤ و بەدبینەکەت لە سەردانیدا بۆ لای مێزەکەت گلەیی و گازندە بەردەوامەو یەك لە دوای یەکەکانی توانا و لێهاتوویی هەیە، ئەوا تۆ ئارام و هێورو لەسەرخۆبەو لە نووسینگەو شوێنکارەکەتدا پیاسەیەك بکە.

ئارامی و ئاسودەیی لە ئاودانی گوڵ و گیایەك یاخود لە دروستکردنی فنجان و پیاڵەیەك قاوەدا پەیدا بکەو دەست بخە، لەوانەیە هەندێ کەس ئەم کارە بە ساویلکەیی و گێلی بزانێت، بەڵام تۆ دەتوانیت وەك پشوویەك تەماشای ئەم کارە بکەیت.

هەنگاوی چوارەم/ بە ئەدەب و رێزەوە بە هاوکارە نێگەتیڤەکەت بڵێ کە: حەز لە گوێگرتن لە گلەیی و گازندەکانی ناکەیت.

هەرچەندە لەوانەیە ئەم شێوازە قسەکردنە بریندارکەر بێت، بەڵام حەقیقەت و راستییەکەو باشتر وایە کە بووترێت، لەوانەیە ئەنجامدانی ئەم کارەش سەخت و دژوار بێت، بەڵام نرخ و ئەرزشی ئەوەی هەیە.

هەنگاوی پێنجەم/ لە بارەی گلەیی و گازندە بەردەوامەکانی هاوکارە نێگەتیڤەکەتەوە لەگەڵ بەرێوەبەرو سەرۆکەکەتتدا قسە بکە.

پاش هەموو ئەو هەوڵ و کۆششانەی کە رووبەرووی شکست بوونەوە، ئەم شێوازە دوایین رێگە چارەیە.

بەڵام کاتێك کە هاوکارە نێگەتیڤەکەت بایەخی بە بیرخستنەوەو هۆشدارییەکانت نەدا، ئەوا پێویستە سود لەم رێگە چارەیەی سەرەوە وەربگریت.

بە دڵنیاییەوە کە قسەکردن لەگەڵ بەرێوەبەرو سەرۆکەکەتتدا کارێکی ئاسان نییە، بەڵام ئومێدەوارین کە ئەو بتوانێت هەڵ و مەرج و بارودۆخەکان چارەسەرو چاك بکات.

سەرچاوە/ گۆڤاری «موفقیت» ژمارە (١٦٤).

ئا: گۆیان عەبدولڕەحمان

# هێزی دەسبەسەراگرتنی خود

کاتێك تەمەنی دوو مانگ بوو فیلە سپیە بچوکەکە لە ئەفریقا کەوتە نێو تەڵەی راوچیانەوەو لە بازارەکاندا بە پیاوێکی دەوڵەمەند فرۆشرا کە خاوەنی باخچەیەکی ئاژەڵان بوو، خاوەنەکەی دەستبەجێ فیلەکەی نارد بۆ ماڵە تازەکەی لە باخچەی ئاژەڵانداو ناوی لێنا (نیلسۆن)، کە خاوەنەکەی لەگەڵ نیلسۆندا گەیشتە جێگا نوێیەکە، کرێکارانی باخچەکە قاچێکی نیلسۆنیان بە زنجیرێکی ئاسنی بەهێزەوە بەست، بە کۆتایی ئەم زنجیرەشەوە گۆیەکی گەورەیان پێوەکرد کە لەئاسنی پتەو دروستکرابوو و نیلسۆنیان لە جێگایەکی دووری باخچەکە دانا، بەرامبەر بەم مامەڵە دڵرەقانەو توندوتیژانەیە نیلسۆن هەستی بە تورەبوونێکی توند دەکرد، بۆیە بڕیاری دا لەم بەندییە خۆی رزگار بکات، بەڵام چەند هەوڵی دەدا هێندە زیاتر زنجیرە ئاسنینەکە لە پێی توندتر دەبوو.. پتر هەستی بە ئازار دەکرد، لەدوای هەوڵیکی زۆر ماندوبوو و نووست.

رۆژی دواتر نیلسۆن بێدار بووەوەو هەمان کاری دوێنێی بۆ رزگارکردن ئەنجام دایەوە، بەڵام بێ سوود بوو. بەم جۆرە تا ماندوو دەبێت و ئازار دەچێژێت.. لەگەڵ زۆری هەوڵەکانی و ئازارو نوشوستییەکانیدا بڕیاری دا ئەم واقیعە نوێیە قبوڵ بکات، ئیدی جارێکی دیکە هەوڵی خۆ رزگارکردن نەدات، بەمەش خاوەنە دەوڵەمەندەکەی توانی نیلسۆنی فیل بەرنامەرێژ بکات، دروست وەك ئەوەی کە دەیەوێ.

شەوێك کاتێك نیلسۆن نوستبوو خاوەندار لەگەڵ کرێکارەکانیدا رۆیشتن بۆ لای و گۆیە ئاسنینە گەورەکەیان گۆڕی بە گۆیەکی بچووکی لە تەختە دروستکراو کە دەگونجا ئەمە هەلێك بێت بۆ نیلسۆن تا خۆی رزگار بکات، بەڵام ئەوەی روویدا تەواو پێچەوانە بوو.. فیلەکە وا بەرنامە رێژکراوە کە سەرجەم هەوڵەکانی شکست دێنن و دەبنە هۆی ئازارو برین. خاوەنی باخچە ئاژەڵانەکە باش دەزانێت نیلسۆنی فیل زۆر بەهێزە، بەڵام بە تەواوی بەرنامە رێژکراوە لەسەر ناتوانایی و بە کارنەهێنانی هێزە خودیەکەی، هەروەها دەشزانێت نیلسۆن لەسەر قبوڵکردنی واقیعە نوێیەکەو توانای گۆڕینی واقیعەکەی نییە، بەرنامە رێژکراوەو تواناکانی خۆی لەدەستداوە، رۆژێك منداڵیکی بچووك لەگەڵ دایکیدا سەردانی باخچەکەی کردو پرسیاری لە خاوەن باخچەکە کرد: کاکە دەتوانی پێم بڵێیت چۆن ئەم فیلە بەهێزە هەوڵ نادات ئەو گۆیە تەختەیە رابکێشێ و خۆی لە بەندی رزگار بکات؟ «پیاوەکە گوتی:» بە دڵنیاییەوە کورم! خۆت دەزانی کە نیلسۆنی فیل زۆر بەهێزەو لەهەر کاتێکدا بیەوێت خۆی رزگار بکات دەتوانێت، بەڵام گرنگتر لەمە ئەوەیە کە ئەو ئەمە نازانێت و مەودای هێزی خۆی نازانێت»!

پەیامی ئەم چیرۆکە چییە؟

زۆرینەی خەڵك هەر لەمنداڵییەوە بەرنامەرێژ دەکرێن بەشێوازێکی دیاریکراو هەڵسوکەوت بکەن، بە شێوەیەکی تایبەت بدوێن، کۆمەڵێك بڕوای دیاریکراویان هەبێت و لە هۆکار گەلێکی دیاریکراوەوە هەست بە کۆمەڵە هەستێکی سلبی بکەن، هەست بە کەساسی دەکەن لەبەر چەند هۆیەکی دیاریکراو، هەر بەو هەڵسوکەوتانەوە بەردەوامن لەژیاندا، دروست وەك نیلسۆنی فیل، بەمەش بوونەتە بەندی بەرنامە رێژی بیروبڕوا سەلبیەکانیان کە تواناکانیان لە پێگەیشتن و بەدەستهێنانی ئەوەی شایەنیانە لە ژیانیاندا سنوردارکراوە، بۆیە دەبینیت رێژەی تەلاقدان زیاد دەکات و کۆمپانیاکان دەرگاکانیان دادەخەن، هاورێییەکان دوژمنایەتی یەکتر دەکەن، رێژەی ئەو کەسانەی بەدەست نەخۆشییەدەروونیەکان و ژانی گەدەو سەرئێشەی درێژ خایەن و دژوارییەکانی دڵەوە دەناڵێنن، بەرز دەبێتەوە. هەموو ئەمانە تاکە هۆکارێکیان هەیە، ئەویش بەرنامەرێژی خراپە. بەڵام دەکرێت ئەم دۆخە بگۆڕێت لە بەرژەوەندیمان، تۆ و من و هەموو مرۆڤێکی سەرزەوی دەتوانێت ئەم بەرنامەرێژییە بگۆڕێت و بیکاتە بەرنامەیەکی دیکە کە یاریدەمان بدات بۆ ژیانێکی کامەران و ئامادەمان بکات بۆ بەدەستهێنان و دەستەبەرکردنی ئامانجەکانمان. دەبێت ئەم گۆڕانە لە هەنگاوی یەکەمەوە دەست پێبکات، ئەویش ئەوەیە بڕیاری گۆڕان بدەیت.. ئەم بڕیارەت رێگات بۆ رۆشن دەکاتەوە بۆ ژیانێکی باشتر، وەك خودای میهرەبان دەفەرموێت: {ان الله لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم}.

پێویستە بزانیت هەموو گۆڕانێك لە ژیانتدا سەرەتا لە ناخەوە دەستپێدەکات، لەو رێگەو شێوازەی بیری لێ دەکەیتەوە.. ئەمە دەبێتە هۆی شۆرشێکی زەمینی گەورە کە دەگونجێت کامەران یان کەساست بکات، ئەمەش دەکەوێتە سەر بیرکردنەوەی خۆت.

سەرچاوە: ئینتەرنێت.

# وتەی ناوداران سەبارەت بە گەشبینی

ئالانی

١- ناتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ رابردوو بۆ ئەوەی سەرەتایەکی نوێ دابنێیت، بەڵام ئەتوانی ئێستا دەست پێ بکەیت کۆتاییەکی نوێ دابنێیت.

٢- هەڵوەرینی فرمێسکەکانم لەبەرئەوە نییە کە خەمبارم، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە چاوەکانم پێویستیان بە پاککردنەوە هەیە.

٣- گەشبین لە دەرگایەکی داخراو دەدات، ئەگەر لێی نەکرایەوە دەڕوات بۆ دەرگایەکی تر، ئەگەر ئەویش نەکرایەوە دەرگایەکی نوێ دروست دەکات.

٤- نابینیت زستان تا کۆتایی ژیان بەردەوام بێت، بەهاریش هاتنی بیربچێتەوە!

٥- دڵنیابە ئەو کارەسات و مەینەتیانەی کە تۆ توانای هەڵگرتنیت نیە، هەرگیز نایەنە رێت!

٦- ئەگەر کەسێکی گەشبین دەستی چەپی بڕا، دەڵێت ئاساییە چونکە لانی کەم کەس داوای هاوکاریم لێ ناکات، کە من کەم ئەندامم!

٧- گەشبین گوڵەکان دەبینێ و هەرگیز ناڕوانێت بۆ دڕکەکان، بەڵام رەشبین دەڕوانێتە دڕکەکان و گوڵەکان نابینێ!

٨- هەموو رۆژێك کە لە خەو هەستە و بڵێ: ئەمڕۆ باشترین رۆژە لە ژیانمدا!

٩- گەشبین و رەشبین هەر دووکیان بەشداری دەکەن لە کۆمەڵگەدا، هەر یەکێکیان بە رێگەی خۆی، گەشبین فڕۆکە دا ئەهێنێ و رەشبینیش پەرەشوت!

١٠- گەشبین لە کاتی بینینی کوپێکی نیوەدا بەشە پڕەکەی ئەبینێ و خۆشحاڵ دەبێ، بەڵام رەشبین بەشە بەتاڵەکەی ئەبینێ لەبەرئەوە نائومێد دەبێت!

١١- کاتێك تاریکی بەهێز دەبێت، دەتوانیت ئەستێرەکان ببینیت!

# دوژمنانی کات!



خەڵات محەممەد رەئوف

وا ئەمڕۆش خۆر لە خۆرهەڵاتەوە دەرکەوت و مژدەی رۆژێکی نوێی هێنا، بابەو دایە بەیانی زوو لەخەو هەڵسان، بابە بەرەو ئیش وکار کەوتەرێ و دایەش خەریکی راپەڕاندنی کاری ماڵەوەیە، کاتژمێر (١١)ەیە بەرەو نیوەڕۆ دەڕۆین، دایە گوتی: باشە دەبێت منداڵەکان خەریکی چی بن؟ تۆ بڵێی خەریکی خوێندنەوەبن یان خەریکی کارێك بن؟ هم.. ئەمە لە ماڵی ئێمە بەدوورە دڵنیام هێشتا نوستوون بە هەموو هێزێکییەوە هاوار دەکات: «کوڕم... کچم... لەگەڵ ئێوەمە وادەبێتە نیوەڕۆ بەسە ئیتر بۆگەنتان کرد لە ناو جێگا». کوڕو کچی چی؟ خۆ جاری یەکەم و دووەم هەر گوێشیان لێ نییە ناهەقیشیان نییە فەقیرانە شەوی رابردوو تا دوو سێی شەو سەیری فلیمیان کردووەو چاتیان کردووە، بۆ جاری سێیەم و چوارەم دایە دیسان دەقیژێنێ «ئەهای رۆڵە گیان لەگەڵ ئێوەمە» ئەم جارە تۆزێك خۆیان دەجوڵێنن و بەرپەرچی دەدەنەوە «ئۆف... پیرەژن بۆ ناهێڵی تۆزێك بنووین»؟ پاشان بە کاوەخۆیی بەتانییەکە فڕێ دەدەنە سەر زەوی و بە بۆڵە بۆڵەوە بەرەو دەستشۆرییەکە دەکەونە رێ، دێنە سەرمێز بۆ نان خواردن ئەگەر دایە چاکەی نەرشتبێ «ئم.. ئاخ.. سەرم.. پشتم.. خوامەرگ.. چەند بێزارم....» هەتا نیوەڕۆ ئەمە قسەیانە پاشان گەر کچە مەیلی لێبوو لە نانی نیوەڕۆدا یارمەتی دایکی دەدات، کوڕەکەش دەچێتە ژوورێك بۆ چوتە چوتی مۆبایل کاری هەیە ئیتر بەخەڵکی رادەبوێرێ.

نانی نیوەڕۆ خورا دایە داوای لە کچەکەی کرد قاپەکانی بۆ بشوات، بە هەرحاڵ قبوڵی کرد زۆر نابەرپرسانە لەبەرچاوی دایەو بابە مۆبایلەکەی خستە سەر گۆرانی، ئاخر توخوا با بێزار نەبێت لە کاتی قاپ شتن، پاشان دەچێتە ژووری براکەی ماوەیەك دەمەقاڵێیان دەبێت، «قەیناکە شەڕ لە بەتاڵی باشترە» دوایی دەکەونە گیانی (ئێم.بی.سی)ەکان و لەسەر یەك سەیری فیلم دەکەن تا دەمی خۆر ئاوا بوون پاشان کچە دایکی هەراسان دەکات» بابچین بۆ پیاسە یان بۆ مۆڵەکان یان بۆ ماڵان دەی ئاوانابێت ماندووبوم لە ژوورەوە رەفیقی من هەرناکەوێتە ماڵ، کوڕەکەش لەگەڵ چەند هاورێیەکی دا دەچێتە دەرەوەو بێ ئامانج بە کوچەو شەقامەکانی شاردا دەسورێنەوەو وەك دوژمنێکی سەرسەختی کارو بکوژێکی دڵرەقی کات دێنە بەرچاو. ئێستا کاتژمێر بۆتە (١٢)ی شەو دووبارە کاتی فیلم و چاتە حەیاتەکەیە، ئەمڕۆش تەواوبوو بەیانی و دووبەیانی و هەتا پشووی هاوین تەواو دەبێت بەم شێوەیەیە. بەینی خۆمان بێت لەکاتی قوتابخانەشدا فەرقێکی ئەو تۆی نییە. لە هەمووشی سەیرتر ئەوەیە کەدەمیان دەکەیتەوە قسەی گەورە گەورە دەکەن و رەخنەو گلەیی دەبارێنن. منیش کڵاشم دڕاو هیچم پێنەبڕا. ئازیزان ناڵێم هەموو بەڵکو زۆربەی گەنجانی کورد پاڵەوانی ئەم چیرۆکەن. کەواتە گەر تۆ خۆت بە پاڵەوانێکی ئەم چیرۆکە ترسناکە دەزانیت ئەوا دڵنیابە کە تۆ گرەوی ژیانت دۆڕاندووە، لەبەرئەوە تازووە بڕیاربدە خۆت بگۆڕیت!!

# ژیان هیوایە

پەیام عوسمان کەریم

ژیان بێ هیواو ئاوات هیچ نرخێکی نیە. ژیان‌و هیوا دووانەیەکی پەیوەستن بەیەکەوە، وەك مرۆڤ چۆن لە رۆح‌و لاشە پێکهاتووە، بە بێ رۆح جەستە مانایەکی نییە، ژیانیش بەو شێوەیەیە!

هیوا رۆحی ژیانە ئاسوودەیی پێ دەبەخشێت، رۆحیش ئەو پاڵنەرەیە کە شتە وەستاوەکان دەبزوێنێ‌و دەیخاتە جووڵە، وەك ئەو تەختەیەی دەخرێتە دەریاوەو دەریا دەبێتە رۆحی.

بەڵام! کاتێك هیوا لە ژیان دادەبڕێت.. هەروەك نوسەری رووسی بە ناوبانگ «فیۆدۆر دۆستۆیفسکی» دەڵێت: (بێ هیوا ژیان کارەساتە).

بەراستی گەر بڕوانین دەبینین کاتێك هیوا لەژیان دادەبڕێت، هیچ مانایەك بۆ ژیان نامێنێتەوە، دەبێتە دۆزەخ. دۆزەخیش ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ تیایدا ئازار بچێژێت، گرنگ نییە دوای مردن بێت یان پێش مردن هەردۆزەخە.

بەڵێ! بێ هیوایی ژیان دەکوژێت.. جوانییەکانی تەمەن وشك‌و بێ بەرهەم دەکات.

بۆیە پێویست دەکات لەسەر ئێمەی مرۆڤ کە پەروەردگاری مەزن بە جوانترین شێوە دروستی کردوین هەمیشە گەلێك ئاوات‌و ئامانج لە ناخماندا بێت‌و بیکەینە هاودەمی خۆمان، تا مۆتەکەی بێ هیوایی نەتوانێت دەستی بگاتە بەرۆکمان. هەروەك چۆن ماسی بێ ئاو ناژی، هەرواش مرۆڤ بێ هیواو ئامانج ناژی.

هیوا ئەو هاورێ دڵسۆزەیە... کە لە هەناوی کوچە تاریکەکانی نا ئومێدی دەربازمان دەکات‌و دەمان سپێرێت بە سپێدەیەکی گەش‌و رووناك‌و پڕ لە جوانی ژیان.

سەرەتای هەموو کارێکمان لە بیرکردنەوەوە دەست پێدەکات‌و پاشان هیواو ئامانج‌و گەشەو پێشکەوتنمان هەر هیواکانمانە، ئەگەر هیوا نەبوایە گەردوون‌و هەموو شتەکانی سەر گۆی زەوی دەوەستاو لەکار دەکەوت.

هیوا وامان لێدەکات هەمیشە ژیانمان خۆشبوێت‌و هەوڵ بدەین بۆ باشتر کردنی...

کێڵگەی سەوز.. ئاوازی نەرمی باران.. بزەی خۆر.. کار.. گشت جوانییەکانی سروشت بەرێزێکی بێ پایان سەیریان بکەن.

هیوایە! کەشتی مرۆڤایەتی بەرەو پێش بردووە، هەمیشەو هەمووکات لە جولەو بزاوتی داهێنان‌و بەرەو پێش بردندایە.

با هزرمان پڕبێت لە هیواو کارەکانمان هەر بە هیوا بێ‌و با ئاواتەکانمان بەرز بڕوانێ. چونکە ئاواتەکانمان هێزێکی گەورەیان هەیە کە لە ئاستەنگەکانی ژیان‌و دەورو بەرمان دوورمان بخەنەوەو بەرەو ئایندەیەکی پڕ کامەرانی‌و گەشمان بەرن.

هیواکانمان، خەونەکانمان، ئامانجەکانمان، ئاواتەکانمان با گەشاوەبێ... ژیانمان پڕ لە جوانی‌و سەوزی... تەمەنمان، کاتەکانمان بە کردەوەو کاری جوان بنەخشێنین... لە کۆتاییدا پێت دەڵێم: تاکەی بەرگی بێ هیوایی‌و نەزانی فڕێ نادەی؟!

تاکەی بیر لە جوانی سروشت‌و ژیان ناکەیتەوە؟!

تاکەی چاوە گەشەکانت هەڵناهێنی، تا ببینی چەندین کەس بە هیوا بەرزوو گەشەکانیان بەرەو پێش چوون، چونکە کۆمەڵێ ئامانجیان لە هزردا هەبووە؟!

ئەی نازانی بە هیواکانت بەختەوەری بۆ خۆت‌و ئایندەت مسۆگەر دەکەی، گەلەکەشت بەرەو بەختەوەریی هەتا هەتایی دەبەیت؟!

# من گەشبینم

یوسف واژەیی

هەموو رۆژێ دوای سپێدە لەگەڵ یەکەم رۆژی نوێدا. کە خۆر هەڵدێ مژدەی ژیانی نوێی لەگەڵ دێ. وا هەست ئەکەم تەنیا رۆژباش لە من ئەکا. خۆشەویستی ئاشکرای خۆی لە ناخی منا ون ئەکا. بۆیە تا بەرزتر ئەبێ خۆشەویستی لە وجودما بەتین‌و گەرم تر ئەبێ. دڵی شێتم شەیداو بێ شەرم تر ئەبێ. ترپە ترپی خێراترو هەنگاوی نەرم تر ئەبێ.

ئای چەند گەش‌و تاسەدارم. چەند تامەزرۆو بەهەرەدارم. لە ژوانێکی گەرم‌و گوری دڵ پڕ گوڕی. هیلاکی‌و ماندویی بڕی سەر بە خۆدام...

سەرم بەخۆدا گرتووەو سەد ئێرەیی بەخۆم ئەبەم. لەگەڵ بوونی ئەم مەعشووقە بەشەوقەدا.

بۆیە کاتێ ئاوا ئەبێ. چاو لە ئاسۆگی سوور ئەبڕم. ساردو سڕو مات‌و کڕم بەم دڵە پڕ لە ئومێدو هیوایەوە چاوی حەزو چاوەڕوانیم هەموو دەم وا بەدوایەوە...

چاوەڕێم تا جارێکی تر دیسان هەڵبێ. جارێکی کەش مۆمی ژیانم هەڵبێت‌و خەم‌و پەژارەم لێ هەڵبێ. دڵم بە عەشقی تێکەڵ بێ...

بێتەوە بۆ جێ ژوانەکەی ئەم سەر زەمینە بەرینە، تا لەپاش بارانی چاوی لە دووری یار زۆر گریاوی، بێ خەوو سوور هەڵگەڕاوی منی عاشق بیکاتە پەلکە زێرینە...!

لەناو جەرگەی نیوە شەوا، منی بێنازو بێنەوا. وا هەست ئەکەم تەنها لەبەر خاتری من ئەستێرەکان مەجلیسێکیان ساز کردووە، مانگی چواردەش تەنها گوێ بۆ سەرگوزشتەی من ئەگرێت‌و چاوی بۆ من باز کردووە. وا ئەزانم عەشقی ئێمە خۆ سازدان‌و مەشقی ئێمە، لە عەشقەکەی مەم‌و زینیش ئازاترو ئازادترە. چونکە ئێمە هەموو شەوێ دوای ئەوەی هەموو شەیدایەك خامۆش ئەبێت‌و ئەخەوێ چرا لە سووتان ئەکەوێ. هەر بێدارین.

هەرچەندە هێزی تاریکی تادێ فراوان تر ئەبێ. گۆڕەپانیش بۆ رووناکی هەتا دێ پاوان تر ئەبێ. بەڵام مانگی منی تەنیا گەشاوەو تابانتر ئەبێ.

من لە ئاسمانی تاریکا سەیری تریفەی مانگ ناکەم. بۆ گەیشتنم بەو دڵدارە هۆکارێکی کە بانگ ناکەم. لە ئاوێنەی دڵی خۆما بۆی ئەڕوانم. چونکە بەم شێوە ئەتوانم بەبێ تەم‌و چڵکە هەور ئەو ببینم. بۆیە ئەڵێم من شەیداتر لە عەشقەکەی مەم‌و زینم...

وەرزی بەهار شنەی شەماڵ. کە هەڵ ئەکا بەکزەو سۆزو نەرمە باڵ.

رووخساری من لە پێش هەموو گوڵێکی کەو لەوان زیاتر... لەوان سەرسام ترو جیاتر ئەکرێتەوەو ئەشنێتەوە. گوڵان ئاونگ هەڵئەڕێژن گوڵی رووی من ئەچنێتەوە...

بە ئاوی کانی کوێستانی دەستنوێژی ئەوین ئەشۆم‌و بە چۆڕاوگەی بەفری چیا ئەشکێنم رۆژووی رۆژانی خۆشەویستی.

بەخوڕەی ئاوی قەڵبەزی باڵابەرزی روون‌و رەوان لە جەستەی خۆم دائەماڵم چڵك‌و چۆڵی خۆپەرستی. بە لەوێچی ئاونگی گوڵ کێڵگەی دڵم پاراو ئەکەم...

سەر زەمینی قاقڕو وشك هەڵاتووی ناو هەناوم تێراو ئەکەم...

بە بارانی پەڵەی چاوم. بەدەستی زبرو خاراوم. پەروەردە ئەکەم چەکەرەی تۆوی سادەیی ژیان‌و خۆنەویستی...

دەمەو گزنگ لەگەڵ بولبول بەستەی شادی ئامێز ئەچڕم. لەگەڵ گوڵی تەڕو ناسك ئاونگ لە چاوانم ئەسڕم. بۆ خۆشی ژین پێئەکەنم. داوی رایەڵەی ئاوات‌و هیوا بوون بە ژیان ئەتەنم.

پەردەی رەشی ماتەمینی‌و نائومێدی لە رووی خۆما دائەدڕم...

بەڵێن ئەدەم چاوی دڵم تەنها خۆشی پێ ببینم پڕ بەقوڕگم هاوار ئەکەم.

سەرجەم مرۆڤانی پەست‌و هیوا بڕاو لەم هەواڵە وشیارو ئاگادار ئەکەم.

پێیان ئەڵێم نزیکم لە بزەو خەندەو دوور لە شینم. ئەگەر دنیا تەنها رووناکی مۆمێکی هەبێ من گەشبینم... من گەشبینم!

# دیوی زەمینی‌و دیوی ئاسمانی

ئازاد محێدین - خورماڵ

زۆر شت دوو دیوی هەیە بڕوانی
دیوێ زەمینی‌و دیوێ ئاسمانی
نموونەی کەوتن، لەگەڵ خۆخستن!
مەرگی نەخوازراو، لەگەڵ خۆ کوشتن!
خۆت بەدەستی خۆت لە دەمی مارا
ژەهر دەردێنی بێ وێنەو کارا!
ئەی نۆشی‌و دەمری لەو بڕیارەدا!
خەتای مار چییە لەو کردارەدا!؟
بە دار گوێزا بەردێکی هەڵدا
نەی پێکا مەبەست هاتۆ بەسەردا!
بۆ جاری دووەم نەی پێکا ئامانج
چواری تر کەوتن سێ دانە قازانج!
بۆ جاری سێهەم وەك نەبوو دەست کەوت
چاوی لەدەست دا بەری لقێ کەوت!
توانات خستە کار لە هەر کارێکا
ڕێ‌و شوێنی گونجاو لەهەر بوارێکا
گەر سەر نەکەوتی لە نەسرەوتنا!
بزانە سەر کەوتن وا لە کەوتنا!

عادل شاسواری

# گرنگترین نهێنی سەرکەوتن و شادمانی چییە؟

جارێکیان لە رانیە کۆڕێکم هەبوو لە سەر (خوێندنەوەیەکی نوێی مێژووی بەدرخانییەکان- هۆکاری نوشوستی شۆڕشەکەیان).. زۆر جەختم کردە سەر هۆکارە ناوخۆییەکان (کە کورد خۆیو بەتایبەت بەدرخانییەکان) بوونەتە هۆی سەرنەکەوتنی درێژەدان بەو ئەزموونە، لە بیرمە لە کۆتایدا برادەرێك هەڵساو ئاماژەی بە گەورەییو گرنگی هۆکاری دەرەکی کردو زۆر دڵنیا بوو کە ئەگەر ئەو هۆکارانە نەبوونایە ئەوا ئەو ئەزموونە نوشوستی نە دەهێنا، منیش وتم: لاریمان لە هۆکاری دەرەکی نییە، بەڵام ئەگەر ئێمە بەدوای چارەسەردا بگەڕێین، بۆ ئەوەی چیتر بەئاکامی تاڵ نەگەینو بە ئەنجامێك نەگەین کە لێی پەشیمان بین، دەبێ ئەوە بە راستییەکی بەدیهی بزانین کە دوژمنی دەرەکیمان هەیەو لە هەر دەرفەتێك دەگەڕێ کە زەبری خۆی بووەشێنێ، بەڵام گرنگ ئەمسەری هاوکێشەکەیە، ئایا ئێمە تا چەند بیانوو ئەدەین بەدەستەوە بۆ دروست بوونی ئەو دەرفەتەی کە ئەو بتوانێ ئەو رۆڵە خراپە بگێڕێ؟ ئایا ئێمە دەتوانین لەکوێوە دەست پێبکەین؟ خۆمان یان ئەوان؟ هەوڵ بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەی هۆکارە ناوخۆییەکان بدەین یان بەتەمای نەمانی هۆکارە دەرەکییەکان بین ئینجا بیر لە شۆڕش بکەینەوە؟ کامیان بەدەست خۆمانەو کامیان بەدەست ئەوانە؟

ئەمە لەسەر ئاستی تاکیش هەزوایە، زانایانی بواری (NLP)یش باش ئەزانن کە هەموو هۆکارەکانی (سەرکەوتن و نوشوستی) تەنها تاك خۆی نیە، بەڵکو هۆکاری بابەتیو خێزانو ژینگەو دەوروبەرو کۆمەڵگەو جیاوازییەکانی تاك.... هتد، بەڵام هێشتا گرنگییەکی زۆر بەتاك ئەداتو هانی تاك ئەدات کە خۆی، خۆی بکاتە سەنتەری هەموو هۆکارو ئەنجامەکان، بۆچی باشە؟ لەبەرئەوەی مێشکی مرۆڤ کە پێکهاتووە لە دە ملیار خانەی دەماری، (یەکێك دابنێو بیستوپێنج سفر لەبەردەمیدا) ئەوەندە (ئەگەر) هەیە ئەو دەمارانە نێتۆرکێك دروست بکەن بۆ پێشکەوتنیو دڵخۆشبوونو ئاسوودەیی مرۆڤ، بۆ سەرکەوتنی مرۆڤ، رزگاربوونی لەو چەقبەستوویەی کە تائێستا هۆکاری پێشنەکەوتنی بووە، بەڵام ئەو ئاکامەی کە ئێستە هەتەو لێی نارازیت چەند بری هۆکارەکەی بخەیتە سەر شانی هەر کەسێکی تر بە قەدەر بری ئەو هۆکارە خۆت لە بەرپرسیارییەتی چاککردنی ئەدزیتەوە، بە قەدەر قورساییو قەبارەی ئەو برەش کێشەکە هەر دەمێنێتەوەو چاك نابێت، هەتا زیاتر بڵێیت من بۆیە سەرنەکەوتوم: (خەتای دواکەوتوویی وڵاتو ناوچەکەمانەو خەتای هەست نەکردن بە بەرپرسیاری حکومەتو حیزبەکەمانەو خەتای نەبوونی دامەزراندنو خراپی کۆمەڵگاو دابین نەکردنی مافەکانمانەو خەتای دڵرەقی بەرێوەبەرو کەم دەستی بنەماڵەو نەخوێندەواری باوکمەو خەتای شەریکی بەخیلو برادەری خراپو چاوی خەڵکە، خەتای نەبوونی بروانامەو نەزانی مامۆستاکانمانە، خەتای ئیسلامو مەلای گەرەکەکەمانەو.....هتد) ، بەم قسانە ئەزانی کێشەی تۆ چی لێ دێت؟ هەر ئەوەنیە رابردووت لەدەست چووە بەڵکو داهاتووش لەدەست دەدەیت، بەمانە کارەکەتو حاڵت لە ئێستا خراپتر دەکەیت، راستە ژیان لەژێر دوو هێزدایە کە مرۆڤ بۆ لای خۆی کێش دەکات: یەکەم: هێزی راکردن لە نارەحەتی، دووەم: تامەزرۆیی گەیشتنە بە خۆشی، بێگومان راکردن لە نارەحەتیش هەروا ئاسان نییە، وەك ئەدیسۆن دەڵێ: لە دونیادا حەشارگەیەك نییە مرۆڤ پەنای بۆ بەرێت تا بەرگەی ئازار نەگرێت، ئا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئەو هۆکارە دەرەکیانەی دیاریت کردوون بۆ خۆت ئایا ئەتوانی بیانگۆڕیت؟ نەخێر.. بەڵام ئەگەر خەتاکە بخەیتە سەرخۆتو خۆت بکەیت بە چەقی رووداوەکان ئایا دەتوانی رێرەوی رووداوەکان بگۆڕی؟ هەرخۆت ئەڵێی بێگومان، چونکە خۆم دروستکاری ئێستای خۆمم کەواتە ئەشتوانم بە گۆڕینی پرۆگرامی ژیانم ئێستاو داهاتووشم بگۆڕم، چونکە دەبێ بزانی ئایندە نایەت ئەمرۆ دەچێت بۆ لای، ئەو دانابەزێ تۆ بۆی سەردەکەویت، دڵنیابە ئایندە ئێستایە.

پاش دیاریکردنی هۆکارەکانی نوشوستی، زۆر گرنگە مرۆڤ نەخشە دابنێ بۆ رێی سەرکەوتنو دڵخۆشبوونی، چونکە سەرکەوتنو شادومانی نایەن، بەڵکو دروست دەکرێن، لە دەرەوە نین لە ناوەوەن، پلانی رێی گەیشتن بە ئامانج، بەسەرکەوتن، بەشادمانیو دڵخۆشی، دەبێ خۆت بینووسی، پاشان کاتی دەستپێکردنی

# ئارەزوومەندانە بیر بکەوە

قاسم سروش

ئێمە لە دارستانێکدا دەژین، پڕە لە گیانداری گۆشت خۆر، گیا خۆرەکان هەردەم دەترسن، بەهێزەکانیش بێ ترس دەخەون، ئەو کەسە ژیرە بتوانێت خۆی بکاتە هاوڕێ لەگەڵ شێرو نەترسێتو لە مردنیش سڵ نەکاتەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر بترسینو بمانەوێت سەربکەوین بێگومان بە ئامانجی سەرکەوتنەوە دەبێت سەربنێینەوە، باشترینمان ئەوەیە ئارەزوومەندانە بیربکاتەوەو ئارەزوومەندانەش بڕیار بدات، ئارەزوومەندانەش ئاراستەی خۆی بکات بۆ ئەو بۆچوونو بیروباوەڕەی کە هەیەتی، پشت بە کەس مەبەستە بۆ بیرکردنەوە مەکەوە ژێر فشارو بیرکردنەوەی کەسانی تر، لەبەرئەوەی ئەگەر بە بیری کەسانی تر بیرمان کردەوە ئامانج بۆ ئەو کەسە دەهێنینە دی، خۆشمان دەبینە هیچ لە هیچ. زیاتر مرۆڤی ژیرو خاوەن توانا تووشی گرفت دەبێت، ژیان بێ گرفتو ئاستەنگ مانای نیە، زۆر کەس وابیردەکەنەوە ژیانی ئارامو هێمن دەوەستێتە سەر نەبوونی گرفت، بەڵام زۆر هەڵە تێگەیشتوونو بیردەکەنەوە، دونیا خۆی تاقیکردنەوەیە چ مانایەکی دەبێت ئەگەر هەموومان بە خۆشی ژیانو هیچ گرفت نەهاتە بەردەم پرۆسەو ژیانمان، کۆسپە گەورەکان زامنی بە دەست هاویشتنی بەردی گەورەیە بۆ شکاندنی ئامانجی گەورەو سەرکەوتنی بێ سنور، با وا بیربکەینەوە کە ئێمە دەمانەوێت بچین بۆ بازار ئەگەر پارەمان پێنەبوو و ئامانجیشمان کڕینی کەلوپەلێکی بە نرخ بوو، ئەوا بێ سوود دەچین بۆ بازار، چونکە کەس ئامادە نییە بە ئەو کەلو پەلەی مەبەستمانە پێمان ببەخشێت بە خۆڕایی، هەر بەو جۆرەش پشت بە خۆت ببەستە لە سەرکەوتنو هێنانەدی ئامانجەکان، لەبەرئەوەی کەس ئامادەنابێت بێت، کاتی خۆی بە فیڕۆ بداتو هاوبەشیمان بکات لە سەرکەوتن بۆ ئامانج. هەوڵبدە نەکەویتە ژێر فشاری هیچ کەسێك، بەڵام بەو مانایە نا کە گوێ بۆ هیچ کەس ڕانەگرین، لە ئەنجامی ئەزموونی کەسانی تر دەتوانین خۆمان بپارێزین لە گرفتانێك کە لە ئەنجامی بەسەر هاتی تاکێکی تر پێمان گەیشتووە...

سەرکەوتن بەئێمە نابەخشێ، پێویستە بەکۆششی خۆمان لێی دەربێنین. بەڵام لە کوێوە؟ دۆزینەوەی ڕێگای بەختەوەری بە قەدەر بەختەوەری گرنگە، هی واهەیە مانگاکە لەبەردەمیدایە بەڵام ڕێگای بەدەست هێنانی شیرەکە پێنازانێ، ئایا لەچ ڕێگەیەکەوە شیرەکە ئەدا؟ شاخەکانی.. لاقەکانی..کلکی.. گوێی..نەخێر (گوانەکانی)! لەوانەیە ئەم وردکردنەوەیە لای هەندێ کەس زیادەبێ، چونکە هەموومان ئەو ئاژەڵەمان بینیووەو دەزانین لەکوێوەو چۆن ئەو شیرە ئەدا، بەڵام خۆ ئێمە مەبەستمان مانگا نییە؟ باسی ژیان دەکەین، هەمووشمان بینیوومانە، ئەی ژیان چۆن بەختەوەری دەدات؟ ئایا هەموومان ئەیزانین؟ ئەمە بە تەواوی وەك وانەی قەواعیدی عەرەبی وایە لە ڕۆژانەدا هەموو نموونەکانی سادەنو لەسەر(زید)ن بەڵام تاقیکردنەوەکەی زۆر قورسە ئایەتی وا دێتەوە مەلای دوانزە عیلمیش نازانێ ئیعرابی بکات.. کەواتە: مەرج نییە وەك نموونەکەمان سادەیە واقیعەکەشمان سادەبێت، هەروەك مەرج نییە ڕێگای بەختەوەری هەمووشمان یەك بێت، مەرج نییە یەك هۆکاریش ئاکتیڤ بێت بەدەست هەموومانەوە بۆ دۆزینەوەی ڕێی بەختەوەری. تۆ چ هۆکارێ دەگریتە بەرو چ ڕێگایەك بە باش دەزانی بۆ گەیشتن بە بەختەوەری، لەراستیشدا چەند هۆکار هەنو کامیان ڕاستن؟! چەند ڕێگا هەنو چەندیان ڕاستن؟؟!! ئەمە کێشە سەرەکیەکەیە، کە تۆ ئەگەر بە هەموو تەمەنت لەسەر ئەزموون کردنی ڕێیەك بیت تابتوانی بیسەلمێنی چەندە شیاوی دەست نیشانکردنە، دیسانیش کەسانێك هەن کە پێیان وایە تۆ لە هەڵەدایتو ئەسڵەن ئەوە کوێرە ڕێیەو بانگەوازەکەشت لە بانگکردنی خەڵك بۆ پوچگەرایی زیاتر نییە.. هەر بۆیە ئەوە خۆتی ئەو ڕێگایەت هەڵبژاردووەو وریاو ئازابە لە جێبەجێ کردنیداو دڵت لە نەیارەکانت نە لەرزێ، تەنها ڕای خۆت گرنگە بۆسەرکەوتن نەك کەسانی تر..

لە کۆتاییدا دەڵێم: مادام پانزە هەزاردینار تەسجیلێك دەکات، خەریکە بڵێم ئەو پارەیە لە تەسجیلەکە گرنگترە، هەر بۆیەش گرنگە، چونکە ئەو کاغەزانە تەسجیل دەکەن، ئەگینا کەس لای لێ نەئەکردنەوە. مادام ئەو باخەی ئەوبەر گرنگە کەواتە ئەو پردەش کە بەسەریدا دەپەڕینەوە بۆئەو بەر گرنگە، هەرچی شتێك ببێتە هۆی دڵخۆشیو بەختەوەری کەواتە خۆشی بەختەوەرییە، کەواتە ڕاستە دۆزینەوەی ڕێگای بەختەوەری بەقەدەر بەختەوەری گرنگە.

یەکەم هەنگاو دیاری بکە، لەگەڵ بوونی هەر هۆکارێکدا کە لە دەرەوە بێت درێژیو پانیو قورسی هەرچەند بێت، گرنگ نییە گرنگ ئیرادەو ویستی خۆتە تاچەند بڕوات بەخۆت هەیە ڕووبەڕووی ببیتەوە؟ ئەوە ئەنجامت دیاری دەکات نەك زەمەن، جاری واهەیە ئەو سەرکەوتنە خێرا نایەت، دەبێ بووەستی بەدیارییەوە، هەروەك چۆن عاشقەکە وەستا بەدیار مەعشوقەکەیەوە، ئەگەر تۆ عاشقیت مەعشوق گۆڕین بێ عەقڵیە، بەڵام گۆڕینی ڕێی گەیشتن بەمەعشوق عاقڵیە، بتهۆڤنیش دەڵێ: ئەوەی لە هەوڵدان ماندوو نەبێ هەر سەردەکەوێ. لەم پێناوەشدا لە کەوتن مەترسە هەروەك ئەنتۆنی ڕۆبینز دەڵێ: (ڕێگا بدەن پرسیارێکتان لێ بکەم: بەمنداڵی چەندجار کەوتوون بە زەویدا تا بەسەر پێ کەوتوون؟ بێگومان زۆر، بۆیە ئەگەر لەگەورەییشدا ئەوە بکەین بەپێوەر سەرکەوتن مسۆگەرە).

شادمانو گەشبینەکان هەمیشە بەشە پڕەکەی پەرداخەکە دەبینن و سەرنجی خۆیان لەسەر ئەو بەشە چڕ دەکەنەوە. ئەوانە هەمیشە ئیجابی بیردەکەنەوەو شەپۆلی ئیجابیش بڵاودەکەنەوە. ڕێ نادەن ئەو شتانەی لە توانایاندا نییە، بێتە ڕێگری ئەوانەی دەتوانن بیکەن. لە لای هاوڕێکانیان سکاڵا ناکەن، چونکە لەوانەیە وەك قرژاڵەکانیان لێ بێت، دەریاوانەکان، کە قرژاڵیان ڕاو دەکرد لە کەناری ئۆقیانووسەکاندا دەیانخستنە ناو سەبەتەیەکەوە، گەر لەسەبەتەکەدا تەنها قرژاڵێك هەبێ بۆ ئەوەی ڕێ لەجوڵەی بگیرێتو نەیەتە دەرەوە دەبێ سەرقاپێکی بخرێتە سەر، بەڵام ئەگەر دووان یان زیاترن بوون سەرقاپ پێویست ناکات، چونکە هەریەکەیان ئەوی دی ڕادەکێشێتە خوارەوە.

(ئیبراهیم ڕەفیق) لەسەر ئەم ڕووداوە پرسیار دەکاتو دەڵێ: بەڕای ئێوە ئەم مۆدێلی هەڵسوکەوتە ئادەمیزاد لە قرژاڵەوە یاخود قرژاڵ لە ئادەمیزادەوە فێربووە؟!

ئەدیسۆن بەسکاڵا کردن لە تاریکی تەمەنی تەواو نەکرد، بە پێچەوانەوە بەردەوام بە دوای ڕووناکی گەڕا، هەتا دۆزییەوە، فۆردی ئەمریکی سەرەڕای بوونی ئەسپ تێکۆشا لەگەڵ هاتنەڕێی چەندین کۆسپو چەندجار ئیفلاسکردنیش هەر کۆڵی نەدا هەتا بەسەرکەوتن گەیشت... چەندەها نموونەی تریش.

ڕۆژێك لە پیاوێکی دنیا دیدەی گوندنشین دەپرسن:

- مانگاکەتان چەند شیر ئەدات؟

- پیری خاوەن بیریش دەڵێ: مانگاکە شیر نادات دەبێ خۆمان لەگوانییەوە لێی دەربێنین، ژیانیش هەروایە دڵخۆشیو بەختەوەریو

# چاوەڕوانی سوپاس مەکە!

سایە فارس

پیاوێك لە کەناری دەریایەکدا دانیشتبوو، دەیروانیە شەپۆلەکانی‌و چێژی لە تیشکە ئەرخەوانیەکەی خۆر وەردەگرت، لەو کاتەدا بینی منداڵێك لەو پەڕی بێ هیوایی دا لەگەڵ شەپۆلەکانی دەریاکە دەجەنگێ‌و خەریکە رووبەرووی مەرگ ببێتەوە، ئەویش بەخێرایی خۆی هاویشتە ئامێزی دەریاکەو بەرەو پیری منداڵەکە چوو، تا گەیشتە لای منداڵەکەو باوەشی پێدا کردو بەرەوە کەناری دەریا کەمەندکێشی کردو لەسەر لمی کەنارەکە دایناو لە خنکان رزگاری کرد، هەرچەندە منداڵەکە بێهۆش‌و تەواو شەکەت‌و ماندوو ببوو، بەڵام فریاگوزارییە سەرەتاییەکانی بۆ ئەنجامدا تا هاتەوە هۆش خۆی‌و چاوەکانی هەڵهێناو پاشان هەستاو دوورکەوتەوەو ئەو شوێنەی جێ هێشت، پاش ماوەیەك بینی منداڵەکە لەگەڵ ئافرەتێکدا بەرەو لای ئەو دێن، لە دڵی خۆیدا وتی: بێگومان ئەوە دایکییەتی‌و بۆ سوپاس کردنی هاتووە، چونکە کورەکەیم لە خنکان رزگار کردووە!

ئافرەتەکە نزیك بووەوەو لێی پرسی: تۆ کوڕەکەمت لە خنکان رزگار کرد؟

ئەویش بە خاکییەکەوە وتی: بەڵێ خانم.

ئافرەتەکە وتی: ئەو کاتژمێرەی لە دەستی دا بوو چی لێ هات؟!

بێگومان هەمووان لەم هەڵوێستە سەرسام دەبن‌و دەزانن ئەو پیاوە لەو کاتەدا چ هەستێکی ناخۆشی هەیە، لەبری سوپاس‌و پێزانین‌و دەستخۆشی لێکردن لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت!

لەوانەیە وا بیر بکەیتەوەو بڵێیت ئیتر هەرگیز ئەم پیاوە بیر لە یارمەتیدانی کەس ناکاتەوە، تۆ بڵێی ئەگەر ئەو رووداوە دووبارە ببێتەوە، ئەم کەسە هەمان هەڵوێستی هەبێت؟ بێگومان لای مرۆڤی چاکەکارو خۆ نەویست، وەڵامەکەی بەڵێیە! چونکە ئەو جۆرە مرۆڤانە چاوەڕوانی سوپاسی بەرامبەر ناکەن‌و درێغیش لە کردنی چاکەو پیاوەتی ناکەن‌و ئەم جۆرە هەڵوێستانەش کاریان تێناکات‌و لە یارمەتیدانی خەڵکی ساردیان ناکاتەوە!

کەواتە نابێت چاوەڕێی سوپاس بین لەبەرامبەر هەستان بەکارێك هەرچەندە قورس‌و گرانیش بێت، گرنگ ئەوەیە تۆ بتوانیت ئاسانکاری بۆ بەرامبەرت بکەیت‌و یارمەتی بدەیت، چونکە پاش ئەوەی کارێکی باش بە ئەنجام دەگەیەنی‌و سودێك دەبەخیشتە کۆمەڵگەکەت ویژدانت ئاسوودە دەبێت‌و دەروونت دەحەوێتەوە ئەوەش دیاری‌و سوپاسی خوای گەورەیە بۆمان کە زۆر لە سوپاسی بەندەکان بەنرخترو گەورەترە، کەواتە بێ هیوا مەبەو بەردەوام هەنگ ئاسا شرینی ببەخشە با سوپاسیش نەکرێیت.

پێنەزانین‌و سوپاس گوزار نەبوون سروشتێکی کۆنی مرۆڤەو لەدێر زەمانەوە بوونی هەیە، ئیمپراتۆری رۆمانی (مارکۆس ئۆرلیس) ١٧٠٠ ساڵ پێش ئێستە نووسیویەتی: «ئەمرۆ چاوم بە چەند کەسێکی خۆپەرست‌و پێنەزان دەکەوێت، ئەوەش سەرسامم ناکات چونکە ژیان خاڵی نییە لەو کەسانە!» مارکۆس خۆی راهێناوە بۆ قبوڵ کردنی ئەو کەسانە هەتا توشی خورپە نەبێت‌و نائومێدی باڵ نەکێشێ بەسەریدا!

بۆ ئەوەی نەبینە مایەی هەراسان کردن‌و بێزارکردنی بەرامبەرەکانمان‌و نائومێدیان نەکەین، تا نەبینە هۆکاری وازهێنانیان لە کاری باش‌و یارمەتی‌و ئاسان کاریی یەکانیان، پێویستە هەموو کات سوپاسیان بکەین...

زانایەك دەڵێت: «ئەگەر کارێکی بەسودت بۆ هەرکەسێك کرد، ئاگاداربە بیری نەخەیتەوە، بەڵام ئەگەر کەسێك سوودی پێ گەیاندیت ئاگاداربە بیرت نەچێتەوە!»، مەبەستی ئەوەیە ئەگەر هەستای بە راپەراندنی کارێك بۆ هەرکەسێ ئامان بیری مەخەرەوە تا سوپاست بکات، بەڵام ئەگەر ئەو کارە بۆ تۆ کرا هەرگیز بیرت نەچێتەوە سوپاسی بکە.

بۆچی ناتوانین سوپاسی بەرامبەر بکەین؟

بۆچی کارە باشەکانی بەرامبەر لە بیرخۆمان دەبەینەوە؟

خۆ ئەوە زۆر ئاسانە هیچ ماندوو بوونی ناوێ! ئەی بۆ پێی نازانین؟

سوپاس کردن یەکێکە لە نیشانەکانی کەسی هۆشیار... یەکێکە لە ئاکارەکانی کەسانی نەرم‌و نیان‌و پێشکەوتوو بە وەفا.

سوپاس کردن پەیوەندی بە دروستی کەسایەتی سوپاس کەرەوە هەیە، چونکە هەست بە هیچ کەم بونێك ناکات بەرامبەر ئەوەی کە سوپاس‌و پێزانینی خۆی دەردەبرێت... بێگومان کەسانی پێزان‌و ستایش کاری کارەکان لەناوکۆمەڵگەدا سەرەڕای ئەوەی ئاست‌و پلەیەکی بەرزیان هەیە لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویست‌و رێزلێگیراون، بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی کە پێنەزانن، چونکە مافی بەرامبەریان پێشێل دەکەن، پێشێل کردنی مافیش دەبێتە مایەی نارەحەتی سەرەڕای لەدەست دانی رێزو خۆشەویستی بەرامبەر، کەواتە بۆ ئەوەی خۆشیان بوێیت، تا بە هاورێیەتیت ئاسوودە بن، ئەوا چاوەڕێی سوپاس مەکە، بەڵام سوپاس کردنت بیر نەچێت.

سەرچاوە/ سود لە کتێبی (الشخصية الساحرة)وەرگیراوە.

# کچان و کوڕان لە نێوان ئازارو ئاواتدا



# ساڵێکی نوێو کەسێکی نوێ

کچانو کورانی لاوی ئەم وڵاتە شیرینە، ئەمڕۆ پاش پشوویەکی باش دەگەڕێنەوە سەرکورسییەکانی خوێندنو لە ئامادەیی و پەیمانگاو زانکۆکاندا درێژە بەهەوڵو کۆششی خۆتان دەدەن لە پێناو بەدەست هێنانی زانستو زانیاری و رۆشنبیری و مەعریفەتدا.

خۆشەویستانم هیوادارم ئەم ساڵتان جیاوازبێت لە ساڵانی ترو بە بیرێکی نوێو بەرنامەی نوێو رۆحێکی نوێوە بێنەوە مەیدان.

ئومێدەوارم سودمەند بووبن بە خوێندنەوەی رێنماییەکانی بڕیارو بڕیاری گۆڕانو نوێکردنەوەو هەوڵدانتات دابێت.

ئاواتەخوازم قەناعەتتان بەوە کردبێت، کە ئێوە دەتوانن زۆرکاری گەورە ئەنجام بدەنو بە پشت بەستن بە تواناکانتان دەتوانن لاوێکی سودبەخشو پۆزەتیڤو بەرهەمهێنو چالاك بنو جێگای متمانەو هیوای گەلو نەتەوە بن.

دەبا خۆمان بۆ ساڵی نوێ ئامادە بکەینو بەرنامەکانمان ئەم تەوەرانە لە خۆ بگرێت:

١- تەوەری سەرەکی: گرنگیدانت بە خوێندنو موتالاکردنی وانەکانی خوێندن.

٢- تەوەری دووەم: دیاریکردنی کاتێك بۆ خوێندنەوەو زیادکردنی رۆشنبیری و زانیاری لە دەرەوەی سنووری بەرنامەکانی خوێندن.

٣- تەوەری سێ یەم: مومارەسەکردنی ئارەزوویەك یا زیاتر بەپێی کاتو گرنگی ئارەزووەکان وەك پشودانێك بە مێشكو رۆحو دیاریکردنی جێ دەستێك لە دونیای داهێناندا.

٤- تەوەری چوارەم: گرنگیدان بە تەندروستی و وەرزشو هێزی لەشو لارو بنیاتنانی لاشەیەکی تەندروستو پڕ لە وزەو چالاکی.

ئازیزانم وێرای گرنگیدان بە خودو هەوڵی پەرەپێدانو پێشکەوتنی، نابێت دەوروبەرو کەسوکارمان لەیاد بچێتو لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا کەمتەرخەمی بکەین، چونکە ئەو کارە کاردانەوەی خراپی دەبێت لەسەر ئێستاو ئایندەمانو وادەکات کە کەسێکی خودپەرستو خود پەسەند بینو تەنها بۆخۆمان بژین.

چ جای ئەوەی کە کەسایەتییەکی لاوازمان دەبێت لە پەیوەندی کردنو پەیوەندی بەستن لەگەڵ مرۆڤەکانی دەوروبەرماندا.

خوانەخواستە هەر کاتێك ئەمە روویدا بۆشاییەك دروست دەبێت کە بە زانستو زانیاری پڕنابێتەوە.

کەواتە پێویستە بەرنامەیەك بۆ گرنگیدان بە باوكو دایكو خوشكو براو سەردانی خزمو کەسو هاوڕێیانمان دابنێین بەشێوەیەك کە زیان بە رەوتی خوێندنمان نەگەیەنێت.

دوای هەموو ئەمانەش رێزگرتنی کاتو زانینی نرخی کات نهێنی سەرکەوتنمانە لە هەموو هەنگاوەکانی ژیانماندا.

زۆر گرنگە کە لاوی دڵ پڕ لە هیواو چاو پڕ لە ئاوات کاتە زێرینەکانی ژینی لاوی بە مۆبایلو تەماشاکردنی فیلمو پەیوەندی سۆزداری بەناو خۆشەویستی کە هێشتا کاتی بیر کردنەوەشی نەهاتووە بە فیڕۆ بدات.

سەرگەرمبوون بە بلوتوثو پلەی ستەیشنو یارییەکانی سۆنی و فیلمی ترسناك تەنها مێشك ماندوو دەکاتو هیچی تر.

دەتوانین کاتەکانی پشوو بە خوێندنەوەی چیرۆكو رۆمانی بەسود، تەماشاکردنی بەرنامەی تەلەفزیۆنی بە ئامانج، وەرزشو یاری سود بەخش بەسەر بەرین.

لەگەڵ هیوای سەرکەوتنم بۆ هەمووتان.

# ئاسۆی وێنەیەک

سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیاڵی تیژو هەستی ناسکت بۆی بنوارەو پاشان خامەکەت هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسکو خەیاڵە وردو سۆزە بێ سنوورەت بکە، تا ببیتە خاوەنی یەکێک لەم دوو خەڵاتەی خوارەوە:

- بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێکی گۆڤاری بڕیار.
- بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی گۆڤاری بڕیار.

دوا مۆڵەتیش بۆ وەرگرتنی وەڵامەکان (١٠) ڕۆژ دوای دەرچوونی گۆڤارەکەیە.



سوپاس بۆ ئەم بەڕێزانەی کە لە خوارەوە ناویان هاتووە، بە شیعر یاخود پەخشان بابەتیان ناردووە بۆ ئاسۆی وێنەی ژمارە (١٥).

(فەرهاد عوسمان خدر – بەهرۆز شێرزاد – عومەر مەحمود رازانی – شیرین ئیسماعیل محەمەد- جەلال نادر حەمە خان- بەختیار عەبدوڵا- موختار حەمە نوری حەمە ئەمین)، دەستان خۆشو هەر سەرکەوتوو بن، چاوەڕوانی بەرهەمی نوێتانین.

# راهێنانی مێشك

به وردی لەم وێنەیە
ورد بەرەوەو
هێزی مێشك و بیركردنەوەت
بخەرەكار،
بزانە چی دەبینیت؟
تا چ رادەیەك دیدی تێروانینت وردە؟



## خەڵاتی یەكەم/ ئەوین ئەحمەد

وریابە
لە كوپەی هەنگوینا ژار هەیە،
لە رۆحی بە تامی
مۆزێكی ئاڵتونی
شیرینا
ئەژدیهاو مار هەیە،
وریابە
بە وتەی شیرینی مارەكان
نە دۆڕێی،
بە وادەو پەیمانی
ئەژدیها حەوسەرە
پیسەكان
نەگۆڕێی،
قەت نەكەیت دەست خەیتە
نێو دەستی درندە،
ماچ نەكەی تەوێڵی
ئەژدیها،
لەو دیوی
جیهانی
پڕ خەون و خەیاڵات
دێوەزمە نووستووە،
لەو دیوی گوڵی سور
لە پەنای ئەڤینا
كەڵبەی سور
چەندەهای وەكو تۆی
كردۆتە قوربانی،
وریابە
لە پاشان پێم نەڵێی
نەمزانی!!!





# ئایا کەسێکی لە خۆ باییت؟

ئا/بەرزان ئەبوبەکر

لە خۆبایبوون گرفتێکی گەورەی نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە، نەریتێکی قێزەونە، نەخۆشی لە خۆبایبوونو خۆ بە گەورەزانین نەخۆشییەکی ترسناكو شاراوەیە، ئەم نەریتە وەك هەمووو ئەو نەریتە نێگەتیفانەی دیکە خاوەنەکەی هەستی پێ ناکات، ئەگەر ئاگاداریشی بکەیتەوەو پێی بڵێی کە تۆ خاوەنی نەریتێکی لەو شێوازەی، رەنگە زۆر بە توندی وەڵامت بداتەوەو نکوڵی لە بوونی ئەو سیفەتە بکات، نەریتە خراپەکان شتێك نین بە چاو ببینرێن، بەڵکو هەستیان پێ دەکرێت، گرفتەکەش ئەوەیە کە کەم کەس هەیە هەست بەو سیفەتە خراپانە بکات کە لە خۆیدا بوونی هەیە، هەر بۆیە خەڵکی هەست بەم نەخۆشییە ناکەن، لە هەر کەسێکی ئەم سەر زەمینە بپرسیت: ئایا تۆ کەسێکی لە خۆبایت؟ رەنگە خۆشی تورە بکاتو پرسیارەکەتی زۆر پێناخۆش بێو لە وەڵامیشدا دەڵێت: نەخێر! چونکە خۆ جلوبەرگ نییە پێی بڵێی رەنگی جلەکانت سورە یا شینە، ئەویش نەتوانێت نکوڵی لێ بکات، گەر دەتەوێت بزانیت تۆ کەسێکی لە خۆبایيو لوت بەرزی؟ یاخود خۆ بە کەم زانوبێ فیزیت؟ دەتوانیت بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە خۆت تاقی بکەیتەوە، بەڵام تکایە راستگۆیانە بە (بەڵێ) یان (نەخێر) وەڵامی پرسیارەکان بدەرەوە، چونکە لە ئەنجامی ئەم وەڵامانەدا دەزانیت کە تۆ کەسێکی خۆ بە کەم زانو سەنگینیت، یاخود لە خۆبايیو خۆ بە گەورە زانیت، پاشان ئەگەر کەسێکی خۆ بەکەم زانیت ئەوا پیرۆزباییت لێ دەکەین، تۆ خاوەنی ئەو سیفاتەی کە لە نێو دەوروبەرو کۆمەڵگەکەت خۆشەویستو بەرێزیت، چونکە تا تۆ خۆت بەکەم بزانیتو فیزاویو لوت بەرز نەبیت ئەوا لای خەڵکی بەرزو بەرێزو خۆشەویستی، بە پێچەوانەوە ئەگەر لە خۆبايیو خۆ بەگەورە زانیت، دڵنیابە لای خەڵکی قێزەونو بچووكو نا خۆشەویستی، مرۆڤی لە خۆبايیو خۆ بەگەورە زان وەکو ئەو کەسە وایە کە لەسەر بەرزییەکەوە راوەستاوەو سەیری خەڵکی دەکاتو زۆر بە بچوکی دەیان بینێت، لە هەمان کاتدا خەڵکیش کە لە خوارەوە دەروانن بە بەرزاییەکە زۆر بە بچوکی ئەو دەبینن، ئەوەش بزانە هێشتا کات بەسەرتدا تێنەپەریوە دەتوانیت ئەم سیفەتەو هەموو ئەو سیفەتانەی هاوشێوەی خۆ بەگەورە زانینن، لە خۆتیان دابرنیتو لە رەگو ریشاڵەوە هەڵیان بکێشیتو لە شوێنیاندا سیفەتی خۆبەکەم زانینو سیفەتە جوانەکان بروێنیت، ئێستا کاغەزو پێنووسەکەت هەڵگرەو زۆر بە وردی وەڵامی پرسیارەکان بدەرەوەو ئەنجامەکەی بۆ خۆت روون بکەرەوە:

**پرسیارەکان:**

١- کاتێك کەسێك رەخنەیەکت لێ دەگرێت، تورە دەبیت؟ یان هەست بەبێ تاقەتی دەکەیت؟ یاخود دەست دەکەیت بە بەرگری کردن لە خۆت؟

٢- کاتێك کەسێك قسەت بۆ دەکات، تۆش قسەکانیت بە دڵ نییە، ئایا قسەکانی پێ دەبریت؟

٣- کاتێك لە بەردەم کەسێك دایت کە پلەو پایەی لە تۆ بەرزترە، ئایا هەست بە نیگەرانی یاخود جۆرێك لە ترس دەکەیت؟

٤- کاتێك باس لە بیروبۆچوونی خۆت دەکەیت، هەست بە ترس دەکەیت لە ترسی ئەوەی کەسانی بەرامبەر هاورانین لە گەڵتدا؟

٥- ئایا زیاتر قسە دەکەیت لەبری ئەوەی زیاتر گوێ بگریت؟

٦- ئایا مامەڵەت لەگەڵ بەرێوەبەرەکەت وەکو مامەڵە کردنی ئەو کەسانە وایە کە لە کارکردندا لە گەڵتدان؟

٧- کاتێك لەگەڵ کەسێکدا گفتوگۆ دەکەیت کە جیاوازن لە بیروبۆچووندا، ئایا مەسەلەکان بە شێوەیەکی کەسیو تایبەت وەردەگریت؟

٨- کاتێك خەڵکی لایەنگیری بیرو بۆچوونەکانت ناکەنو هاورانین لەگەڵتدا، تورە یاخود نیگەران دەبیت؟

٩- حەزدەکەیت هەمیشە گوێبیستی لایەنە باشەکانی خۆت بیت؟ هەوڵەکانت دەخەیتە گەر بۆئەوەی خەڵکی وەسفو ستایشت بکەن؟

١٠- خۆت بە کەسانی دی بەراورد دەکەیت؟ هەست بە خۆشحاڵی دەکەیت کاتێك دەبینی ئاستی ئەو لە تۆ نزمترە؟ یان هەست بە نیگەرانی دەکەیت کاتێك دەبینی ئاستی ئەو لە ئاستی تۆ باڵاترە؟

هەرچەندە ئەمانە کەمێکن لە پرسیارەکان بەڵام ئەگەر زۆربەی یا هەموو ئەم پرسیارانەت بە بەڵێ وەڵام دایەوە، ئەوە دڵنیابە تۆ بە دەست نەخۆشی لە خۆبایبوونو خۆ بەگەورە زانینەوە دەناڵێنیت! هەوڵ بدە چارەسەری خۆت بکەو خۆت لەو دەردە قێزەونە رزگار بکە، پێش ئەوەی ئەو نەخۆشییە بەسەرتدا زاڵ بێتو لەگەڵتدا بجەنگێو نەتوانیت خۆتی لێ رزگار بکەیت.

پێویستە هەمیشە دروشمت ئەم وتە جوانو نایابە بێت: (ئێمەی گرۆی مرۆڤایەتی هەموومان لە یەك کەسین!)، ئەگەر لەم دروشمە تێ گەیشتیت، ئەو کات دەزانیت کە تۆ لە کەس گەورەتر نیتو مرۆڤەکانی دەوروبەرت وەکو تۆ مرۆڤنو پێویستە هەستو سۆزیان رابگریت، ئەوەش بزانە لە خۆبایبوونت دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەو هەڵهاتنی خەڵکی لێت، رۆژێك دادێ کەس لە دەوروبەرت نامێنێ! ئەگەریش وەڵامەکان هەموویان یاخود زۆربەیان بە نەخێر وەڵام درانەوە، ئەوا پیرۆزباییت لێ دەکەین تۆ کەسێکی خۆبەکەم زانو سەنگینو خۆشەویستی، هەوڵ بدە زیاتر پەرە بەم نەریتە جوانەو تەواوی نەریتە جوانەکانی دیکە بدە.

سود لەم سەرچاوە وەرگیراوە/ علاقات/ ژمارە/٢٠.

و: عبدالقهار بلباس– هەولێر



# جۆرەکانی تووڕە بوون

تووڕە بوون یەکێکە لە خراپترین خووەکانی مرۆڤ، لەبەرئەوەی تووڕە بوون سەرچاوەی هەموو نەهامەتییەکە بۆ گرۆی ئادەمیزاد. هەر لەبەر ئەمەشە ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە موسوڵمان خۆی لە تووڕە بوون بپارێزێ، ئەوەتا پیاوێك دێتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) سێ جار پێی دەڵێت: ئامۆژگاریم بکە، پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێت) هەر سێ جارەکە لە وەڵامدا دەفەرموێت: تووڕە مەبە!

بێگومان تووڕەبوونیش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی ترو لە بارێك بۆ بارێکی تر دەگۆڕێت، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین خەڵکی لە بارەی تووڕەبوونەوە بکەین بە چوار بەش:

یەکەم: خێرا تووڕە بوونو خێرا هێور بوونەوە.

دووەم: درەنگ تووڕە بوونو درەنگ هێور بوونەوە.

سێیەم: خێرا تووڕە بوونو درەنگ هێور بوونەوە.

چوارەم: درەنگ تووڕە بوونو خێرا هێور بوونەوە.

١- خێرا تووڕەبوونو خێرا هێور بوونەوە:

ئەم جۆرە کەسە ناتوانێت کاروبارەکانی خۆی بە باشی بەڕێوە ببات، تەنها وشەیەك کاری تێدەکاتو وشەیەکی تر هێوری دەکاتەوە، ئەم جۆرە مرۆڤە هەڵسوکەوت لەگەڵی بە ئازارەو کەسی بەرامبەر نازانێت چۆن لەگەڵی هەڵ بکات، چونکە میزاجی بەردەوام لە گۆڕانکاریدایە، لەوانەیە ئەمرۆ بە وشەیەك تووڕە بێت، بەڵام ئەگەر پاش هەفتەیەك هەمان وشەی پێ بڵێیتەوە لە لای ئاسایی بێت، بە گوێرەی باری دەروونی خۆی.

٢- درەنگ تووڕە بوونو درەنگ هێور بوونەوە:

جۆرێکی ترن لە خەڵك کە تووڕە نابن، بەڵام ئەگەر تووڕەش بن لەوانەیە پەیوەندی لەگەڵ کەسی بەرامبەر بپچڕێنێت بۆ ماوەی هەفتە یا زیاتریش، بەڵام ئەم جۆرە کەسانە تەنها ئەوەیان باشە درەنگ تووڕە دەبن.

٣- خێرا تووڕە بوونو درەنگ هێور بوونەوە:

ئەمەش خراپترینی خەڵکن، لەبەرئەوەی لەسەر بچووکترین شت تووڕە دەبنو خێراش هێور نابنەوە، ئەو کەسانە بە هیچ شێوەیەك ئامادە نین داوای لێبوردن بکەن لەسەر هەڵەکانیان، بە پێچەوانەوە کاتێك کەسی بەرامبەر داوای لێبوردنیشی لێ بکات ئەو زیاتر لەسەر بڕیارە هەڵەکانی پێ دا دەگرێت. کەواتە گەر دەتەوێت خۆتو دەوروبەرو هاوڕێیانت ئاسودەبن ئەوا هەوڵ بدە لەم جۆرە سیفاتە دوورکەویتەوە.

٤- درەنگ تووڕە بوونو خێرا هێور بوونەوە:

ئەم جۆرەیان باشترین جۆری خەڵکن، لەبەرئەوەی نەرمونیانیو ژیری لە خەسڵەتەکانی ئەوانە، بەڵام ئەم خەسڵەتانەیان ڕێگری ئەوەیان لێ ناکات کە هیچ کات تووڕە نەبن، چونکە ئەوانیش مرۆڤنو دەبێ تووڕە ببن, بەڵام زۆر درەنگ تورە دەبن، ئەو کاتەش کە تورە دەبن زۆر بەخێرایی هێور دەبنەوە، بە تایبەت کاتێك داوای لێبوردنیان لێ بکرێت خێراتر هێور دەبنەوە. تۆی خوێنەریش هەوڵ بدە لەم جۆرەیان بیت، چونکە هەم خۆت هەمیشە بەختەوەرو کامەرانو خاوەنی دڵێکی ئارامو ئاسوودەیت، هەم دەوروبەرەکەشت خۆشحاڵو ئاسوودەن بە هاودەمیو هاوڕێیەتی کەسانی وەکو تۆ!!

سەرچاوە: ئینتەرنێت.

پەری شێخ کەریم

# دایکم و باوکم فێریان کردم

هەروەك دەزانین کە دایك و باوك ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە چۆنێتی هەڵسوکەوتی منداڵ و دیاریکردنی ئایندەیەکی باش بۆ نەوەکانیان، لێرەدا سەرەتا باس لەڕۆڵی باوکان دەکەین:

باوکی ئازیز: بەڕاستی کارێکی ناشیاوە هاوسەرێکی چاك بیت، بەڵام باوکێکی خراپ بیت، چونکە خراپیت لە مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵەکانتدا دەبێتە مایەی ئازارو دڵتەنگی بۆ خێزانەکەت، هەوڵبدە باوکێکی چاك و سەرکەوتووبیت ئەمەش کارێکی ئاستەم نییە! بۆ ئەم مەبەستەش منداڵەکانت دڵخۆش بکە بە وتەو کردارەکانت و یارمەتیان بدەو ڕێنماییان بکە بۆ کاری چاکەو یارییان لەگەڵدا بکە، بەگێڕانەوەو خوێندنەوەی چیرۆکی بەسود دڵخۆشیان بکە، هەمیشە با زەردەخەنە لەسەر لێوەکانت بێت و لەگەڵیاندا نەرمونیان بە، هەموو ئەم کارانەت ئەوە دەگەنێت کەتوانیوتە لە سنووری ماڵەکەتدا سەرکەوتن بەدەست بهێنیت و ئایندەیەکی باش بۆ منداڵەکانت دیاری بکەیت، چونکە بەڕاستی منداڵ بەپێی هەڵسوکەوتی خۆمان دروست دەبن، کاتێك دەبینن کە تۆ بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت یاخود دەبینن کە چۆن لەگەڵ دایکیاندا هەڵسوکەوت دەکەیت، ئەوانیش لە سەر ئەو بنەمایە دروست دەبن و هەڵسوکەوت دەکەن و هەست بە بوونی ڕێزو خۆشەویستی دەکەن بۆ دایکیان و لە هەمان کاتدا کاریگەرییەکی زۆری دەبێت بۆ داهاتوویان، بۆ نموونە: کچ کاتێك گەورە دەبێت و دەچێتە قۆناغی هاوسەرگیرییەوە، ڕێزگرتنی هاوسەرەکەی لەدایکییەوە فێربووە، کاتێك منداڵ بووە دایکی چۆن ڕێزی لە هاوسەرەکەی گرتووە، بە هەمان شێوە کوریش لە باوکیەوە فێر بووە کە باوکی چۆن ڕێزی لە خێزانەکەی گرتووە، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەو خێزانانەی کە شەڕو ناکۆکی میوانی ماڵەکانیانە، بەداخەوە منداڵەکانیان شەڕەنگێزو بێ ڕێز دەردەچن، چونکە منداڵان هەمان مامەڵەی باوك و دایك لەگەڵ کەسانی دەرەوەدا دووبارە دەکەنەوە.

ئیبنولقەییمی جەوزی دەڵێت: (هەر کەسێك فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکەی فەرامۆش بکات، ئەوپەڕی خراپەی لەگەڵدا کردووە، خراپ بوونی زۆربەی منداڵانیش بە هۆی کەمتەرخەمی باوك و فەرامۆشکردنیانەوەیە، کە بۆتە هۆی ئەوەی ئەو منداڵانە نەیان توانیوە نەسوود بە خۆیان بگەیەنن و نە بە دایك و باوکیشیان).

لێپرسراویەتی بەرامبەر منداڵ و وریابوونمان لە وتەو کردارەکانمان بەرامبەر یەکتری دەبێتە مایەی ڕاهێنانی منداڵ لە سەر خورەوشتی گەورەو پیرۆز، دەبێت ئەوەش بزانین کە تەنها بایەخدان بە چۆنیەتی جلوبەرگ و خواردن و تێرو تەسەل کردنیان بەس نییە، بەڵکو بایەخدان بە خورەوشتی جوان زۆر گرنگترە بۆیان.

لێرەدا بە نامەیەك کۆتایی بە وتەکانمان دەهێنین کە هەموو منداڵێکی خورەوشت بەرز پاش چوونە نێو ژیانی هاوسەرێتیان بۆ دایك و باوکیانی دەنێرن، نامەکە بەناونیشانی: دایکم و باوکم لە منداڵییەوە فێریان کردوم!!

دایە گیان بەڕاستی تۆ فێرت کردم کە ڕێزگرتنی هاوسەر چەندە کارێکی پیرۆزە، ئای ئەو ڕۆژانە کە گوێم لە وتە شیرینەکانی تۆ دەبوو بەرامبەر باوکم نەمدەزانی نرخی ئەم وتانە زۆر گرنگە، کاتێك گوێبیستی وتە شرینەکانت دەبووم بێ ئاگا بووم کە ئەم کارە بۆ داهاتووی منداڵەکانم زۆر مەبەستە، کاتێك ڕاتهێنام بە قایل بوون و ڕازیبوونی فەرمانی خودایی نەمدەزانی سەرفرازی منت لەلا مەبەستە، بەڵام ئێستا هەموو کارەکانی تۆ زۆر بە بەهاو بە نرخن لە لای من!!)).

باوە گیان لە منداڵییەوە فێری مانای پیاوەتی و چاکەکردنت کردم، نەمدەزانی پیاوەتی پەیوەستم دەکا بە چاکەوە، وتە ڕاستەکانت فێری کردم کە ڕاستگۆ بم لەگەڵ خێزانەکەمدا، نەرمونیانییەکەت لەگەڵمدا فێری کردم کە دووربم لە شەڕانگێزی، لە یادمە کاتێك ئامۆژگاریت دەکردم زۆر بە هێنمی و لەسەرخۆ کارە باشەکانت نیشان دەدام، هەموو ئەم کارانەی تۆ ها ئەوەتا باوە گیان فێری ڕێزگرتنی خێزانەکەمی کردم).

هیوادارم هەموو دایك و باوکێك لە ئاییندەدا منداڵەکانیان بە هەمان نامە دڵخۆشیان بکەن و ماندووبوونیان بەرز بنرخێنن.



# وێنەکان کەی دەشۆرێنەوە؟!

هەمزە عەباس فەقێ

منداڵ سەرەرای ئەوەی یەکێکە لە بەخششەکانی پەروەردگار، رایەڵی درێژە پێدانیشە بۆ ژیانو بەردەوامی مرۆڤایەتی، ئەگەر بتەوێ بەهاو چێژی ئەو بەخششە خواییە زیاتر بزانی سەرێ بدە لەو ماڵانەی کە ساڵانێکە ژیانی هاوسەرییان تێدا گوزەراوەو منداڵیان نییە، چۆن دەستەو نزا لە چاوەروانی خۆزگەی لە دایکبوونی کۆرپەیەکدا بە دڵی ناسكو چاوانی پڕ لە فرمێسکەوە رۆژو مانگ دەژمێرن،گرنگترین کارێك لە دوای لەدایکبوونی منداڵ پەروەردەکردنییەتی بە شێوازێکی تەندروست، هەر بۆیە پەروەردەکردن کارێکی زۆر سەختو پڕ وردەکارییەو پێویستی بە هۆشیاریو سەلیقەیی زۆر هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها پێوەر بۆ زانینی ئاستی رۆشنبیریو سەرکەوتنی سبەینێی هەر گەلو میللەتێك لەمرۆدا بەرزی ئاستو گرنگیدانە بە پەروەردەی منداڵ، لەبەرئەوە دەبێ پەروەردەکاران بە شێوەیەکی گشتی دایکانو باوکان بە پلەی یەکەمو پاشان مامۆستایان، بە تایبەتی مامۆستایانی باخچەی ساوایانو بنەرەتی زۆرگرنگی بەم بابەتە هەستیارە بدەنو هەمیشە لەخەمی پەروەردەیەکی باشو تەندروستدا بن، وەك پرۆژەیەکی شکۆمەندی ئاینیو نیشتمانی لێی بڕوانن، ئەوەی جێگای داخە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا وەکو پێویست درك بەم گرنگییە ناکرێتو پەی بەم کارە پڕ لە رازە نابردرێ، بۆیە زۆر بێ باکانە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم پرسە (پرسی پەروەردەی منداڵ)دا دەکرێ، لە سەرەتاوە بیر لە سازاندنی زەمینیەکی گونجاو ناکرێتەوە بۆ گەشەپێدانی لە رووی جەستەییو دەروونییەوە، بەڵکو لەبەر نەزانینو بێ بەرنامەیی هەر زوو تێك دەشکێندرێتو نایەڵن بە هیچ کلۆجێ کەسایەتییەکی سەربەستو خاوەن متمانە بەخۆی لێ دەربچێت، ئەمرۆ بەچاوی خۆمان بەرهەمی سەقەتی پەرەوردەی دوێنێ دەبینین کە بە چەندان رووخساری وەکو (شەرمنی، لەرزۆکی کەسایەتی، لاوازو بێ توانا لە رووبەرووبوونەوەی کێشەکانی ژیان، ناهاوسەنگ لەبریارو روانینەکانی...هتد)دا دەناسرێنەوە، منداڵ کائینێکی زیندووە خاوەنی هەستو سۆزو خۆشەویستییە، ئەوانەی منداڵ وەکو بێ گیان یان گیانەوەرێکی بێ (هەست) سەیر دەکەن، دواجار دەکەونە هەڵەی زۆرگەورە ئەوەی دەمەوێ لێرەدا بیخەمە روو ئاگادارکردنەوەی دایکانو باوکانە بۆ خۆپاراستن لەم جۆرە روانینە: دەبێ خۆیان لە زۆر کردارو گوفتار بپارێزن لە پێش چاوی منداڵەکانیان، چونکە راستە ئەم منداڵە ئەمرۆ پێنج شەش ساڵەو تێگەیشتنێکی بۆ ئەم وێنانە نییە کە تۆ دەینوێنی، بەڵام دڵنیابە ئەم وێنانە لەنێو ئەرشیفی یادگاری چاوە گەشەکانیدا هەڵدەگرێو کارەساتیش بۆ پەروەردەکاران جا دایكو باوك بن یان مامۆستایان لەو رۆژەوە دەست پێ دەکات کەئەم منداڵە دوای ماڵئاوایی لە تەمەنی منداڵیو لە تەمەنی (٢٠ یان ٢١) ساڵدا لە تاقیگەی چاوەکانیدا ئەم وێنانە دەشواتەوەو بەتوانای ژیریو لێهاتوویی ئێستای بڕیار لەسەر ئەم وێنەیە دەدات!!

بۆیە دەبێت پەروەردەکاران هەمیشە ئاگاداربن نەبنە مایەی نواندنی وێنەیەك لە دیدو زیهنی منداڵەکانیان، کە دواتر لە شوشتنەوەی وێنەکەیان هەست بە شەرمەزاری بکەن، هەروەها مامۆستایانیش بە هەمان شێوە، چونکە کاتێك مامۆستا دەچێتە پۆل ئەرکی پیرۆزی سەرشانی جێبەجێ ناکات، بە منداڵەکان دەڵێت وانە ناخوێنین بۆخۆتان بە بێدەنگی دانیشن یان دوو دوو قسە بکەن ئەم هەڵوێستە لەم کاتەدا مایەی دڵخۆشییە بۆ منداڵەکان، بەڵام دوای چەند ساڵ کە وێنەی ئەم هەڵوێستەی مامۆستا دەشۆنەوە، وێنەیەك بەمناڵی گیراوەو بەگەورەیی دەشۆرێتەوە، دەبێ چ سیمایەك بە رووخساری مامۆستا ببەخشێ؟!! ماوە بڵێم با هەمووومان ئاگاداربین لە کردەوەکانمان هەمیشە خۆمان برازێنینەوە بە جوانترین ئاکارو رەفتارو بەرگی دڵسۆزیو خزمەتگوزاریو وەفاداری بپۆشین تا دواجار وێنە گیراوەکانمان لە دونیاو دوارۆژ مایەی سەرفرازیمان بێت.

# هاوڕێکەت تاقیکردۆتەوە؟!

ئا: هاودین زانا

ڕۆژێـک باوکێك بانگی کوڕەکـەی کرد... کوڕەکەی وەڵامی دایەوە وتی: بەڵێ فەرموو... باوك: کـوڕم چەند هاوڕێت هەیـە لەژیاندا؟ کوڕەکەی لە وەڵامدا وتی: هاوڕێکانم ژمارەیان زۆرە...

باوك: کـوڕم هەموو هاوڕێکانت دڵسـۆزو خۆشەویستن بۆت؟ کوڕەکەی وتی: بەڵێ.

بـاوك: من تەنهـا یـەك هاوڕێـم هەیە لەژیانـدا، کوڕەکەی پێکەنی‌و وتی: تەنها یەك هاوڕێ...

باوکی وتی: بەڵێ تەنها یەك هاوڕێم هەیە کوڕم، بەڵام ئەوەش بزانە بە ئەندازەی هەموو هاوڕێکانی تۆ دڵسـۆزە بۆم...! کوڕەکەی وتی: چۆن دەزانی؟

باوك: بـا هاوڕێکانمان تاقـی بکەینەوەو بزانین چۆنن؟

کوڕەکەی ڕازیبوو...

باوك: بـە کوڕەکەی وت: بـڕۆ بەرانێکم بـۆ بکـرە، کوڕەکـەی بەرانەکەی بـۆ باوکی کڕی‌و هێنایەوە، دواتر سەرییان بڕی‌و پاکیان کـردو گۆشـتەکەیان دەرهێنـا، دوای ئـەوە ورگ‌و ڕیخۆڵـەی بەرانەکەیان خسـتەوە ناو پێسـتەکەی‌و بەدرێژی دایانپێچاو لەکفنێکی سپیان خسـت‌و لەدارەمەیتێکیان توندبەست، پاشـان بـاوك بەکوڕەکـەی گوت: کـوڕم ئەو هاوڕێیانەی زۆر دڵسۆزن بۆت چەندن؟

کوڕەکەی: وتی زیاد لە (٨٠) هاوڕێ!

باوك: هەرئەم شـەو بڕۆ بۆ ماڵەکانیان‌و یەك بە یەك بزانە کامیان لەگەڵتدا دێن؟ پێیان بڵێ کە لەگەڵ کوڕی حاکمی شـار شەڕم بووەو لە دەسـتم کوژراوەو جەنازەکەی لە ماڵەوەیە، ئەمـەوێ بێیـت لەگەڵمـداو بیشـارینەوەو بینێژین...

کوڕەکەی وتی: بەڵێ باشـە، هەر بەوشـەوە چوو لـە دەرگای ماڵی هـەر (٨٠) هاوڕێکەی دا، هەریەکەیان بەبیانوویـەك خۆی دزییەوە هیچ هاوڕێیەکی لەگەڵیدا نەهات، کوڕەکەی گەڕایەوەو بە باوکی گوت: کە هیچیان لەگەڵمدا نەهاتن!

باوکـی وتـی: کـوڕم زۆر باشـە، ئەمـە هاوڕێکانی تۆ بوون، منیش هاوڕێیەکم هەیە، با ئەویش تاقی بکەینەوە بڕۆ بۆلای هاوڕێکەم کە قەسابەو ماڵیان لە فلان گەڕەکە، کارەکەی تێ بگەیەنە، کوڕەکەی چوو بۆ لای هاوڕێکەی باوکـی‌و کارەکـەی تێگەیانـدو وتـی: باوکم داوات دەکات بێیـت لەگەڵمانـدا بشـاریتەوە، چونکـە ڕۆژببێتـەوەو حاکم پێمـان بزانێت هەمووومان لەسێدارە دەدات، هاوڕێکەی باوکی بەبـێ یەك‌و دوو بـەدوای کـوڕی هاوڕێکەی کەوت‌و هـات بۆماڵیان، وتی: کوا جەنازەکە تا بیدەم بەکۆڵمداو بچین بیشـارینەوە، پێکەوە جەنازەکەیـان هەڵگـرت‌و بڕیاریان دا لەخوار شارەوە بیشـارنەوە، جۆگەیەك کە ئاوی پێدا دەڕۆیشـت ئاوەکەیان بـڕی‌و لەناو جۆگەکەدا چاڵێکیان بـۆ هەڵکەندو بـەدارە مەیتەکەوە شاردیانەوەو دایانپۆشـی‌و ئاوەکەیان کردەوە سەرجۆگەکەو گەڕانەوە بۆ ماڵەوە.

دوای ئەم ڕووداوە بەسێ هەفتە باوکەکە بە کوڕەکەی وت: بڕۆ بۆلای هاوڕێکەم‌و سێ کیلۆ گۆشتم بۆ بێنە، کوڕەکەی سێ کیلۆ گۆشتەکەی کڕی‌و هێنایە ماڵەوە، باوکیشی گۆشتەکەی پیا ناردەوەو وتـی: پێی بڵێ ئەوە کەی گۆشـتە؟ دەبێت بۆم بگۆڕیت، کاتێك کوڕەکەی گەڕایەوە بۆلای هاوڕێکـەی باوکی، قسـەکانی پێ گوت یەکسـەر هاوڕێکـەی گۆشـتەکەی بۆگۆڕی‌و ناردیـەوە بۆماڵەوە، بەڵام باوکی کوڕەکە ڕازی نەبوو حەوت جار ئەو گۆشـتەی بە کوڕەکەیا ناردەوە برادەرەکەشی بۆی دەگۆڕی...

لەکۆتا جاردا باوکەکـە بەکوڕەکەی گوت: ئەم جـارەش بۆی بەرەوەو چەند قسـەیەکی ناشیرینیشی پێ بڵێ!

هاوڕێکەی باوکـی زەردەخەنەیەکی کردو پێی گـوت بـە باوکت بڵـێ، حەفتـا جاریتر گۆشـتەکە بنێرێتەوە بـۆی دەگۆڕم دڵ لە دڵ نـەدات لەبەرئەوەی دەزانم ئاو بەسـەر چیدا دەڕوات هیـچ وشـەیەك لـە من نابیسـتێت! کوڕەکـەی گەڕایەوەو ئەم قسـانەی بۆ باوکی گێڕایەوە.

باوکـی وتی: ئەوە هاوڕێکەی من‌و ئەوەش هەشـتا هـاوڕێ گیانـی بەگیانییەکـەی تۆ! بۆیـە دەبێت هەموو کـەس هاوەڵەکەی خۆی هەڵبسەنگێنێت‌و بزانێت بەهای چەندە.

# هۆکاری ڕق لێبوونو کلیلی خۆشەویستی!

هەردی غازی

هەتا ئێستا دوو کەست نەدیووە پێشتر زۆر هاورێی یەکتر بووبن، بەڵام ئێستا نێوانیان تێك چووبێتو لێك دوور کەوتبێتنەوە؟ چەندجار ویستووتە بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵ یەکێکدا کارێك بکەیت بەڵام دوایی پەشیمان بویتەوە؟ قەت رووی نەداوە هاورێیەکت خۆشویستبێ بەڵام پاش وتنی قسەیەك یا ئەنجامدانی کارێك لەلایەن ئەو هاورێیەتەوە، وای لە تۆ کردبێت وازی لێ بهێنیت یاخود ئەو خۆشەویستییەت بۆی نەمێنێ؟ مادەم وەڵامی یەك یا زیاتری ئەو پرسیارانەت لایە، ئەوا دەڵێین: ئێمەی مرۆڤ زۆر کات بەهۆی دوو شتەوە لە دۆستو هاورێکانمان دەکەوین بە قینداو لێیان زویر دەبین، یەکەمیان: ئیرەیی بردنە بەو شتانەی هاورێکەمان خاوەنییەتیو ئێمە لێی بێبەشین. دووهەمیان: ترسە، ترس لەوەی ئەو کەسە ببێت بەزەرەر بۆ ئامانجەکانمانو نەتوانین بەشی تەواوی خۆمانمان دەست بکەوێت (وەك بڵێی خۆمان بەشی خۆمان دیاری دەکەین) ئەمەش وەها دەکات بترسین لەهاوکاری کردنی ئەو کەسو دۆستانەی لەگەڵماندانو تەنها هەوڵ بۆ خۆمان بدەین.

مامۆستایەك نموونەیەکی جوانو بە نرخمان بۆ باس دەکاتو دەڵێ: دە کەس لە دروستکەرانی دەرزی جلوبەرگ دووریەن هەریەکە بە تەنیا دەستیان بەکار کرد. ئەوەبوو بەرهەمی رۆژانەی هەریەکەیان تەنها سێ دەرزی بوو، پاشان ئەمانە بەپێی دەستوری (یەك خستنی هەوڵو کۆششەکانو دابەشکردنی کارەکان) بۆ خۆیان رێککەوتن. ئەوەبوو یەکێکیان ئاسنو یەکێکی تریان ئاگری هێناو، سێهەمیشیان دەستی بەکون کردنی دەرزییەکان کردو یەکێکی تریان دەیخستە ناو ئاگرەوەو یەکێکی تریش تیژی دەکردنەوەو...هتد، ئیتر کاتی هیچ کەسێکیان بەفیرۆ نەرۆیشت، هەریەکەیان سەرگەرمی کارێکی دیاریکراو دەبوو و بە خێرایش ئەنجامی دەدا، چونکە یەکەم کارێکی هەندەکیو سادە بوو، دووهەمیش مەهاراتو شارەزایی تێدا پەیدابوو، کاتێك کە بەرهەمی رەنجو کۆششیان دابەش کرد، دەبینن بەشی رۆژانەی هەریەکەیان لەجیاتی سێ دەرزی، سێ سەد دەرزییە!

ئایا هیچ کات چاوێکتان تورەبووەو ئیرەیی بەچاوەکەی تەنیشتی ببات و بڵێت: بۆ ئەو فلان شتی بینیو من نەمبینیو دەستت خستە سەرم؟ بێگومان شتی وەها قەت روونادات. دەی مادەم راستییەکان بەو جۆرەن، وەرن باپێکەوە دەست بەکارکردن بکەین بۆئەوەی فێربین چۆن دەژین؟ تۆ هەرکەسێکی یاخود لە هەرکارێکدا کاردەکەی ئەوە ئەو دەستورانە بەکاربهێنە، پاشان دڵنیابە لەوەی: تۆ دەبیتە کەسێك هەمووانت خۆش دەوێت مەگەر کەسێ قابیلی خۆشویستن نەبێت. مادەم ئێمە لە ئەشکەوتەوە نەهاتووینەتە دەرەوە کەواتە پێویستە لەسەرمان پێکەوە بژین، ئەوەش بزانن پێکەوە جوانترو گەورەترو سەرکەوتووتر دەبین، وەك دەڵێن: چوار ژمارە یەك گەر بە بێ پەیوەندی لە پاڵ یەکدا بوەستن (١,١,١,١) کۆبکرێتەوە دەکاتە چوار، بەڵام ئەگەر بەهۆی رێزدانانو یەکتر قبولکردنەوە بچنە پاڵ یەکتر (١١١١) ئەوە دەبن بە هەزارو سەدو یانزە!

## فێڵ لەخەڵك دەکەن بە هەردوولا (sms)

SMS

ئازاد علی شەوباش. هەریری

دیارە ئەمە سیستەمێکی تازەی تەکنەلۆژیای سەردەمە بۆ ئێمە. بەڵام لە لای ئێمە لایەنە سلبییەکەی وەردەگرین وەکوخۆی پەیرەوی ناکەین. ئەم سیستەمە تازەیە کۆمپانیاکانی پەیوەندی لەگەڵ کەناڵەکان گرێبەست مۆردەکەن کە هەرنامەیەك (٢٠سەنت) لە بەشدار بووەکە دەروات، داهاتی ئەم نامەیەش بۆ هەردوو لای کۆمپانیاکەو کەناڵەکە دەگەرێتەوە. بەڵام ئەم سیستەمە لە زۆربەی وڵاتان بە تایبەتی لە رۆژهەڵاتی ناوەراست کاری پێ دەکرێت، بەڵام بەشێوازێکی جوانو زانستیانە لایەنی ئیجابی، ئەویش ناردنی سڵاو پەیامو پیرۆزبایی بۆنەکان بۆ دۆستو هاورێیان، بەڵام لە وڵاتی ئێمە بۆیەکترناسینی کاتیو جنێودان یان بۆ بڵاوکردنەوەی ژمارە مۆبایلەکانی یەکتر بەکاردەهێنرێت، زیاتر ئەوەی ئەم نامانە دەنێرن کەسانی لاوو هەرزەکارن تەمەنیان لە نێون (١٨ تا ٢٢) سالین، زۆرێك لەوانە رۆژانە باسی ئەم نامانە دەکەن کە شەوانە بە بەهای (٥دۆلار تا٢٠دۆلار) نامە دەنێرن تاوەکو ژمارە مۆبایلێك وەردەگرن، دواترکور دەردەچێ یان ئەوانەی کە دەیانەوێ وادەرناچێت دوایی کێشەو گرفتی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە. من پێکەنینم بە عەقڵی ئەوانە دێت کەنامە بۆ کەناڵەکان دەنێرن. من تا ئێستا بەشداریم نەکردووە بەڵام هەندێجاریش دەیان خوێنمەوەو زۆر پێدەکەنم هەندێ کاتیش بە کەناڵەکان پێدەکەنم کە ئەم نامانە دادەبەزێنن، چونکە زۆرکات بەرنامەیەکی تەندروستی یان کۆمەڵایەتی کە ئامۆژگاری زۆری هەیە بۆ بینەران بەڵام لە بەشی خوارەوەی نوسراوە (کارێز ئەمشەو دێم بۆ لات) یان (کارە ئەم شەو تەلەفۆن بکە چاوەرێتم)....... هتد، یان زۆرجار کەناڵەکان فلیمێکی بیانی ژێرنوسی کوردی پیشان دەدەن بەڵام بینەر لێی تێك دەچێت نازانێ ژێرنووسەکە بخوێنێتەوە یان نامەکە بە لای من ئەو کەسانەی کە نامە دەنێرن وەك ئامارژەم پێکرد گەنجو هەرزەکارن عەقڵیان کامڵ نییەو عەقڵێکی داخراویان هەیە ئەو دیاردەیە زیاتر چاولێکەرییە.. من پێم وایە ئەم نامانە بۆ کۆکردنەوەی پارەیە بۆ کۆمپانیاکانو کەناڵەکان کە ئەمەش فێڵە لە ئێمەی دەکەن، بوونی ئەم دیاردەیە هۆکارەکەی گوزارشە لە بێکاری گەنجانو بەشداربووان..

# لاساری منداڵ

د.ئەفرام محمد حسن
پسپۆڕی تەندروستی و دەروونی

گەر رەفتارێکی نەگونجاو لە منداڵدا هەبوو ویستمان بیگۆڕین، واباشترە بزانین ئەو شتە لە خۆماندا نییە کەپێویست بە گۆڕان بکات. [ئەدلر].

لاساری یەکێکە لە رەفتارە دیارەکانی هەندێك منداڵ، منداڵ هەندێك کات گوێرایەڵ نابێت یان سور دەبێت لەو رەفتارەی دەیکات، سەرەڕای ئەوەی کەسە گەورەکان چەندجار داوای لێ دەکەن ئەو کارە نەکات.

## لە چ تەمەنێکدا لاساری دەست پێدەکات:

رەفتاری لاساری لە قۆناغێکی زووی تەمەندا سەرهەڵدەدات بەتایبەتی پاش تەمەنی دوو ساڵی، بەهۆی ئەوەی پێش ئەو تەمەنە منداڵ زیاتر پشت بەدەوروبەر دەبەستێت کەمتر رەفتاری لاساری لێ دەردەکەوێت، دوای ئەو تەمەنە سیماکانی لاساری وردە وردە بە دەردەکەوێت.

## شێوازەکانی لاساری:

١- لاساری سووربوون: وەکو ئەوەی منداڵ سوورە لەسەر کردنی کارێك سەرەڕای ئەوەی چەندجارێك سەرکەوتوو نەبووە لەو کارەدا (چاککردنی یارییەك)، ئەم جۆرە لاسارییە دەتوانرێت سودی لێوەربگیرێتو بەهۆیەوە منداڵ هانبدرێت بۆ سەلماندنی خودو داهێنان.

٢- لاساری بێ سوود: وەکو ئەوەی منداڵ سوور دەبێت لەسەرکردنی کارێك بێ گوێدانە دەرئەنجامەکانی.

٣- لاساری لەگەڵ خود: وەکو ئەوەی کاتێك منداڵ لەگەڵ دایکی گرفتی دەبێت، مان دەگرێت لە خواردن سەرەڕای ئەوەی برسییەتی.

٤- هەندێ منداڵ وەك بەشێك لە پێکهاتەی کەسێتییەکەی تاکێکی لاسارو گرفتاوییە.

٥- هەندێ حاڵەت: وەکو گرفتی کەمی ژیری بەهۆی تێنەگەیشتنی منداڵ لە داواکاریەکان یان نەتوانینی جێبەجێکردنی داواکارییەکان بە دیمەنی لاساری دەردەکەوێت.

## هۆکاری لاساری:

١- فرمانی گەورەکان کە هەندێجار نەگونجاوە لەگەڵ تەمەنی منداڵداو رەنگە ببێتە هۆی سزادانی منداڵ، وا لە منداڵ دەکات لاساری بنوێنێت، هەندێجار بۆ چوونی منداڵەکە دروستە وەکو ئەوەی داوای لێ دەکرێت پۆشاکێکی قورس لەبەر بکات لە کاتی یاریدا کە جوڵەی سنوردار دەکاتو ناتوانێت بە هەمان شێوەی هاوەڵەکانی یاری بکات، لە روانگەی باوانەوە بۆ ئەوەی سەرمای نەبێت.

٢- خۆ شوبهاندن (لێکچواندن) بە گەورەکان کە منداڵ سوور دەبێت لەسەر ئەوەی لاسایی گەورەگان بکاتەوە، سەرەڕای ئەوەی ناتوانێت هەمان کاربکات، بەڵام لە هەوڵدانو دووبارەکردنەوە بەردەوامە.

٣- ئارەزووی منداڵ بۆ سەلماندنی خود.

٤- رەقی باوان لە هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵو کەمکردنەوەی چالاکی منداڵ، بەوەی لە سەرجەم کارو چالاکییەکاندا دەیانەوێت منداڵ بە ئارەزووی ئەوان رەفتار بکاتو هیچ بوارێك ناهێڵنەوە تا منداڵ هەست بەوە بکات لەو یارییەدا یان لەو کارەدا خۆشییەکی تێدایە.

٥- هەستکردن بە کەموکورتی بە هۆی نەتوانینی جێبەجێکردنی فرمانەکانەوە، ناچار دەبێت بەلاساری بەرپەرچ بداتەوە. چونکە بە لایەوە باشترە پێی بڵێن منداڵێکی لاسار وەك ئەوەی پێی بڵێن منداڵێکی ترسنۆك یان کەم توانا یان لاواز.

٦- فێرکردنی لە لایەن باوانەوە کاتێک منداڵ لاسار دەبێت باوان یەکسەر داواکارییەکانی بۆ جێبەجێ دەکەن و لە منداڵ دەکات فێری ئەو رەفتارە ببێت. یان کاتێک یەکێک لە باوان داوای کارێکی لێ دەکات و جێبەجێی ناکات ئەوی تریان پاڵپشتی منداڵەکە دەکات و دڵنەوایی دەداتەوە.

**چۆنێتی رەفتارکردن لەگەڵ منداڵی لاسار:**

* پسپۆرانی بواری پەروەردە لەو باوەڕەدان کە باوان هۆکاری سەرەکی چاندنی لاسارین لە نەوەکانیاندا، گرنگترین خاڵی بنەڕەتی ئەوەیە کە باوان کۆک بن لەسەر چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵی لاسار نەک یەکێکیان سزای بدات و ئەوی تریان بیگرێتە خۆی و لەبری سزاکە پاداشتی بداتەوەو وا لە منداڵەکە بکات زیاتر ئەو کارە بکات یان رەفتارە خراپەکانی بشارێتەوەو فێری درۆکردنی بکات.

* هێمن و لەسەرخۆ بە، بەڵام سووربە لەسەر بڕیارەکانت تاکو منداڵەکەت سنوری خۆی بزانێت.

* دانانی رۆتین لە ژیانی منداڵەکەت، وەکو دیاریکردنی کاتی نانخواردن، خۆشتن، خەوتن..... هتد. تاکو هەست بەوە بکات یاسایەک هەیە لەو ماڵەدا ئەو دەبێت پەیڕەویی بکات.

* دوور کەوتنەوە لە ناچارکردنی منداڵ بۆ گوێڕایەڵی بەڵکو پەنا بردنە بەر خۆشەویستی، ئەو لاسارییانەی کە بچوکن وا باشترە پشتگوێ بخرێن نەک سزای منداڵ بدرێت لەسەری، چونکە زۆرجار بە سزادان منداڵ زیاتر سوور دەبێت بۆ کردنی ئەوکارەو هەندێجار بۆ نواندنی رەفتاری خراپتر.

* سەرقاڵکردنی منداڵ بەکارێکی تر گەر برێک تەمەنی هەبێت هەوڵی گفتوگۆ بدە لەگەڵیدا، لەو کاتەدا گفتوگۆی لەگەڵدا بکە مەیخەرە کاتێکی دواتر، چونکە منداڵ بەدواخستنی هەست دەکات براوەیەو لە لایەکی ترەوە کارێکی باش نییە.

* بواری ئازادی بۆ منداڵەکەت بهێڵەرەوە، بۆ نموونە: کاتی بۆ دیاری بکە بۆ سەیرکردنی کارتۆن، بەڵام بواری بدەری بۆ هەڵبژاردنی کارتۆنەکە.

* هەڵبژاردنی سزای گونجاو کە لە ئاستی سزادا بێت نەک هێندە کەم بێت کە منداڵ بایەخی نەداتێ یان هێندە توندو بەهێز بێت منداڵ هەست بە نایەکسانی بکات و هەوڵ بدات بە لاسارییەکانی تر تۆڵەی ئەو سزایە بکاتەوە، هەندێ سزا گونجاوە بۆ هەندێک منداڵ و نەگونجاوە بۆ منداڵێکی تر.

* کاتێک داوای شتێک دەکەی لە منداڵەکەت بە شێوازێک مەیخەرە روو کە هەست بەوە بکات تۆ چاوەڕێی نەکردنی لێدەکەیت، چونکە ئەوە کردنەوەی دەرگایەکە بۆ لاساری. (بۆ نموونە: ئەو شتەم بۆ دەهێنیت؟ یان ئەتوانی دەرگاکە دابخەیت)، بە ڵکو وا باشترە بڵێی کوڕەکەم ئەو شتەم بۆ بێنە، یان کچە جوانەکەم دەرگاکە دابخە).

* لەو کەسانە مەبە کە رۆژێک رێگە بەکارێک دەدەیت و رۆژێکی تر سزای گەورە دادەنێیت بۆ ئەو کارە، گەر بە نیازبووی کارێک قەدەغە بکەی هەوڵ بدە بە هەنگاو بێت، وردە وردە منداڵەکەت تێبگەیەنە لە هۆی خراپی ئەو کارە.

* هەوڵ بدە رەفتارە نەخوازراوەکان یەکە یەکە قەدەغە بکەی نەک هەمووی بەجارێ، چونکە مەرج نییە منداڵەکەت تێ بگات یان بتوانێت لەبری ئەو سنوردانانە چالاکی تازە بدۆزێتەوە بۆ پڕکرنەوەی کاتەکانی.

* کاتێک داوای کارێک لە منداڵەکەت دەکەیت هەوڵ بدە برێک سودی ئەویشی تێدا بێت و بۆی باس بکە سودی ئەو کارە چییە تاکو زیاتر بە گوێت بکات.

* نەشکاندن و وەسف نەکردنی منداڵ بەوەی تاکێکی لاسارو کەللە رەقە.

* چارەسەرکردنی کێشەکانی خێزان دوور لە چاوی منداڵ، تاکو لەتۆوە فێری تورەیی و هەڵچوون نەبێت.

* وەسف و پیاهەڵدانی منداڵەکەت بیر نەچێ کاتێک شتێکی باش دەکات.

گەر منداڵەکەت لاسار بوو واباشە پەیڕەوی ئەم سێ خاڵە بکەی:

١- بەهێمنی ئاگاداری منداڵەکەت بکەرەوە کە واز لەو رەفتارە بهێنێت.

٢- گەر بە قسەی نەکردی سستەمی هەڕەشەی گونجاوی بۆ بەکاربێنە.

٣- گەر گوێڕایەڵ نەبوو سزایەکی بەسەردا بسەپێنە.

زۆر گرنگە سزایەکی گونجاو دابنێیت کە بواری جێبەجێ کردنی هەبێت، نەک هەڕەشەیەکی نەگونجاو و درۆ بێت، بۆ نموونە: سەرت ئەبڕم، پارچە پارچەت دەکەم، دیارە ئەم هەڕەشانە کە چەندجارێک دەکرێت و جێبەجێ ناکرێت، چونکە بواری جێبەجێکردنی نییە، سزای گونجاو بریتییە لە قەدەغەکردنی سەیرکردنی تەلەفزیۆن، نەچوونە دەرەوە.... یان هەر شتێکی تر کە بەلای منداڵەکەتەوە گرنگە و بێبەشکردنی لەو شتە نابێتە هۆی زیان پێگەیاندنی، بەڵکو وا دەکات بۆ گەیشتن بەو شتە گوێڕایەڵیت بکات.

# ئەی کۆرپەی شیرینم گەورە مەبە

**د. ئالان**

منداڵ ئەو دروستکراوە جوان و بێ وێنەیە کە بە چاو هەڵهێنانی و هاتنە دنیایەوە هەموومان پێی دڵخۆش و کامەران دەبین، دایک و باوک پێویستە رۆڵێکی بەرچاو ببینن لە پەروەردەکردنیان دا، هەر ئەم منداڵانەی ئەمڕۆن سبەی گەورە دەبن و جێی ئێمە دەگرنەوە بۆ پێگەیاندنی کۆمەڵگاکەمان، گەر بەپێی بەرنامەیەکی راست و دروست پەروەردە بکرێن. بەڵام دەبێ بڵێین کۆرپەی شیرینمان لەم کات و ساتەی کۆمەڵگاماندا گەورە مەبە، چونکە سروشتی کۆمەڵگا وای لێ هاتووە کە تەمەنی منداڵیت لێ زەوت بکرێ و نەهێڵن سود لەو تەمەنە وەرگریت، هەر بە منداڵی گەورەت دەکەن و عەقڵییەتی منداڵیت لادەبەن و عەقڵییەتێکی گەورەو ئابوریانەت بۆ دادەنێن... بیرمە کە منداڵ بووم هەموو جۆرە یارییەکی خۆش و جۆراوجۆرمان دەکرد، بە راستی تەمەنێکی خۆش و پڕ جێژمان بردە سەر، زۆر دڵخۆش بووین، گوێمان بە هیچ شتێک نەدەدا، تەمەنی منداڵی خۆمان بوو، مافی خۆمان بوو کە ئەو تەمەنە وەکو منداڵ بەسەر بەرین، بەڵام کە گەورە بووم بینیم منداڵانی ئێستا وەک ئێمە نین، بێبەش بوون لەو تەمەنە خۆشە، جۆرێکی تر بیر دەکەنەوە، یاخود جۆرێکی تر لە عەقڵییەتیان فێر دەکرێ، خۆشترین تەمەنیان کە منداڵیە بیر دەچێتەوەو پەروەردەیەک دەکرێن کە هەردەم بیر لە چۆنییەتی بەدەست خستنی پارە بکەنەوە، پێیان دەوترێ کورم خێرا خۆت پێ بگەیەنەو وەکو ئەو خەڵکە با ئۆتۆمبێل و خانووت هەبێ، دنیا بریتییە لە پارەو سەروەت و سامان، رۆڵە واز لە تەمەنی منداڵیت بێنە.

لەبەر ئەوە دەڵێم: ئەی کۆرپەی شیرینم گەورە مەبە، چونکە عەقڵە مادییەکان تەمەنی منداڵیت لێ زەوت دەکەن!

ئا: کامەران محەمەد ئەمین ئیسماعیل
رانیە



# منداڵ و درۆکردن ٢/٢

★ پەنا بردن بۆ درۆکردن:-

بێگومان هەندێ هێماو هۆکار هەیە بە تەواوی پەردە لەسەر درۆ هەڵدەماڵن، توێژەران ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن بە ڕێژەی ٥٠٪ زیاتر ناسین لە نزیکەوە باشترین هۆکارە، پاشان تاقیکردنەوەی قسە هێنان و بردنەکەی ئەمانە جۆرێکن لە دەرخستنیان، زۆرێك لە سەرکردە سیاسییەکانی جیهان بە درۆ وڵاتەکانیان بەڕێوە دەبەن و کەشەکە رادەگرن لەوانەیە هەوادارانێکی زۆر لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە، بەڵام دوای جێبەجێ نەکردن و پشتگوێ خستنی وادەو بەڵێنەکانیان، زۆربەی هەوادارانیان لە دەست دەدەن، مرۆڤە ڕاستگۆیەکان هەمیشە دەتوانن مرۆڤە درۆزنەکان بناسنەوە، بەو ئەندازەیەی زۆر ئەستەمە کەسێکی درۆزن بتوانێ یەك دوو جار کەسی ڕاستگۆ هەڵبخەڵەتێنێ، چونکە بە یەکەمین درۆ دەناسرێ و زۆرێك لە متمانەی لە دەست دەدا.

★ ناسینەوەی درۆزن و ئاشکراکردنی:

١- کەسی درۆزن بەوە دەردەکەوێت کاتێ قسەی لەگەڵدا دەکەیت ڕاستەوخۆ سەیرت ناکات.

٢- گۆشەی چاوی بەرەو بچوکبوونەوە دەچێت.

٣- هەمیشە زیادەڕەوی لە قسەکانیدا دەکات بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی لە خشتە بەرێ، بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆی قسەکان دەدرکێنێ.

٤- کاتێ قسە لای کەسێك یا کۆمەڵێك بە جیا جیا دەکات لە گێڕانەوەی قسەکاندا جیاوازی بەدی دەکرێت بێ گوێدانە ڕاستییەکان.

٥- هەمیشە خەریکی زەمی ئەم و ئەوە بەردەوام خەریکی قسە هێنان و بردنە ڕۆڵی کەسێکی شەڕانگێز لە ناخدا پیادە دەکا، بە واتایەکی تر ئارەزووی لەوەیە بەردەوام دووکەس بەشەڕ بدات، واتا تا قسەی شەڕ لەوێ بێ قسەی خێری بەدەمدا نایەت.

٦- شارەزایانی بواری سایکۆلۆژی دوو ڕان لەسەر (پێکەنین) هەندێکیان دەڵێن وشەی باق و بریقەو زەردەخەنەو قاقای بەرز تێکەڵی گێڕانەوەی قسەکانی دەکا بۆ سەلماندنی درۆکانی، هەندێکی تر پێیان وایە هەرگیز کەسی درۆزن لە کاتی گێڕانەوەی پێکەنینی زۆر دەرنابڕێت بەڵکو هەوڵدەدات پێکەنین کەم بکاتەوە لە کاتی ئاخاوتنی دا.

٧- بە گەلێك هێما دەردەکەوێت کە درۆ دەکا وەك (دەم گرتن، لووت خوراندن، چاونوقاندن، هەڵکراندنی پشت و مل).

★ کاتێ کەسی درۆزن درۆیەکەی ئاشکرا دەبێ:

١- ڕەنگی دەم‌وچاوی تێك دەچێ.

٢- قسە تێکەڵ و پێکەڵ دەکات.

٣- فشاری خوێن زیاد دەکات.

٤- ژانە سەرێکی قورس دەیگرێ.

٥- خەمێکی زۆر دایدەگرێ.

٦- ئارامی نامێنێ و توشی دڵە ڕاوکێ دەبێ.

٧- ئارەزووی بینینی ئەو کەسەی نامێنی کە درۆی لەگەڵدا کردووەو ئاشکرا بووە، ئامادە نییە بێتە ڕوو بەڕوو.

٨- زۆر بیانوو دێنێتەوە بۆ خۆ دزینەوە لەو قسانەی کە دروستی کردووە بە ناحەق.

★ جۆرەکانی درۆکردن ئەمانەن:

(درۆی خۆ دەرخستن، درۆی خەیاڵی، درۆی بە گومان، درۆی بەرگری لەخۆکردن، درۆی توندوتیژی، درۆی مەبەست و بەرژەوەندی، درۆی لاسایی کردنەوە، درۆی هێور کردنەوە).

★ لە چ کاتێکدا درۆکردن دروستە:

زانایان لەگەڵ ئەوەی بە هەموو شێوازێك درۆکردن ڕەت دەکەنەوە، بەڵام نکۆڵی لەوە ناکەن کە درۆیەك بۆ ئاگر کوژاندنەوە یان کپکردنەوەی کێشەو ئاژاوەیەك یان دامرکاندنەوەی فیتنەیەك یان هێواش کردنەوەی بەڵاو کارەساتێك، لەم کاتەنەدا درۆکردن وەك کردارێکی خێرو چاکە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.

★ چۆنیەتی چارەسەرکردنی درۆکردن لەلای منداڵ:

١- دەرکەوتنی ڕێژەی زۆریو کەمی درۆکردنەکە بەتایبەت ئەو کەسانەی بەرپرسن لە پەروەردە کردنی منداڵان وەك دایكو باوكو مامۆستاو هتد...، ئەگەر ڕێژەی زۆر بوو پێویستە پاڵنەرەکان دیاری بکرێن کە بوونەتە هۆی درۆکردن بە تایبەتی لەو کاتانەی کە درۆکردنەکە بەردەوام بوو.

٢- بەکار نەهێنانی گاڵتە جاریو سزای جەستەییو دەروونیو هەر شتێك ئازار بە منداڵەکە دەگەیەنێت، لە بری ئەمانە شێوەی نەرمو نیانیو سۆزو خۆشەویستی بۆ دەرببڕێت باشترە.

٣- تێرکردنی پێداویستییەکانی منداڵ بە پێی تواناو بەڵێن پێدانو جێبەجێکردنیان بەو بەڵێنانەی لە لایەن باوكو دایكو مامۆستاوە دراوە بەو منداڵە.

٤- پێویستە منداڵ فێری بەها ڕەوشتییەکان بکرێت، بەرەو ڕاستگۆیی هەنگاوی بۆ بنرێت.

٥- منداڵی درۆزن شایەنی شاهیدی دان نییە، چونکە زۆرێك لە متمانەی خۆی لەدەست داوە، ناکرێ تۆ لە ڕوانگەی دیدی خۆتەوە بیکەیتە شاهید بۆ ناو ڕووداوەکان ئەمەش ئاگادار کردنەوەیەکە کەمنداڵی درۆزن بەخۆیدا بچێتەوە.

٦- پێویستە ڕووی کەسەکان تێکەڵ نەکەی واتە کەسی ڕاستگۆو کەسی درۆزن، چونکە هەر یەکەیان تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بەداخەوە تا ئێستاش لە زۆر شوێن کەسی درۆزن لە جێگەی کەسی ڕاستگۆ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێو کەسی ڕاستگۆش بە کەسێکی درۆزن دادەنرێت.

٧- نابێت ڕێگەو بوار بە منداڵی درۆزن بدرێت، چونکە چاودێری نەکردنو کۆنترۆڵ نەکردنی ڕەفتارەکانی هانی زیاتری دەدا لەسەر درۆکردن.

٨- پێویستە سزای منداڵ نەدرێت دوای دان پێدانانی منداڵەکە بە درۆکردن، چونکە دان پێدانانی منداڵەکە بەڵگەیە بۆ ئەوەی خۆی چاك بکات.

٩- پێدانی کارێك بە منداڵ کە لە توانای جەستەییو ژیریدا بێو گونجاو بێت بۆی، ئەمەش وا دەکات منداڵ هەست بە بوونی خۆی بکات برواو متمانەی زیاتر بە دەست بهێنێت.

١٠- جۆرەها ئایەتو فەرموودەو وتەو چیرۆك هەیە لەسەر درۆکردن دەکرێ ئەمانەیان بە شێوەیەکی سادە بۆ باس بکەین کە لەگەڵ تەمەنی منداڵەکەدا بگونجێت، بێگومان منداڵ گوێ لەم بابەتانە دەگرێو هەر نەبێ بەشێك لە ڕێنماییەکانو ئامۆژگارییەکان وەردەگرێ.

لە کۆتاییدا هیواداریین بتوانین بە هەموومان ئایندەیەکی گەش بۆ منداڵەکانمان دەستەبەر بکەین، تا کەسێکی ڕاستگۆیان لێ دەربچێو ببنە پێشەنگ بۆ گەلو وڵاتمان.

# منداڵێك لەژێر تیشکی گەرمی خۆردا

و/ محەمەد مێرگەیی

فرۆشیارێکی کەلوپەلی نووسینو نیگارکێشان، بە کۆمەڵێك فڵچەو کاغەزو پێنووسی ڕەنگاورەنگەوە، چووە قوتابخانەی گوندێك، کە گەیشتە قوتابخانەکە، بینی منداڵەکان لەژێر سێبەرێکدا کتێبەکانیان دەخوێننەوە، تەنها منداڵێك نەبێت، لەژێر تیشکی گەرمی خۆردا، دانیشتبوو وانەکانی دەخوێند.

فرۆشیارەکە پرسیاری لە منداڵەکە کرد: تەمەنت چەندە؟

منداڵەکە وەڵامی دایەوە: تەمەنم حەوت ساڵە.

جارێکی تر فرۆشیارەکە پرسیاری لێکردەوە: بۆچی لەژێر تیشکی ئەم خۆرە گەرمە سووتێنەرەدا وانە دەخوێنیت؟ کەچی دەبینم قوتابییەکانی هاوڕێت لەژێر سێبەری فێنکدا وانە دەخوێنن.

منداڵەکە ئارەقی نێوچاوانی سڕییەوەو بەڕێزەوە وەڵامی فرۆشیارەکەی دایەوە: خێزانەکەی من هەژارە، باوکم بە کرێ کار دەکات، چونکە پارچە زەوییەك یان دوکانێکی نییە، باوکم لەبەر تیشکی گەرمی خۆردا کاردەکات تاکو پارەی خوێندنەکەی من دابین بکات، بە هۆی ئەو ئارەقەی لە ژێر تیشکی خۆری سووتێنەردا لە نێوچاوانی دەرژێنێت، پارەی ئەو فڵچەو کاغەزانە دەدات کە من لە خوێندنەکەمدا بەکاریان دەهێنم، بۆیە منیش کتێبەکەم لە ژێر تیشکی گەرمی خۆردا دەخوێنمەوە!

کابرای فرۆشیار، لەبەر زیرەکی منداڵەکەو ئەو هەستو سۆزەی بەرامبەر باوکی هەیبوو، زۆر ستایشی کردو وەك پاداشتێکیش، باشترین فڵچەی نووسینی بە دیاریی پێبەخشی.

سەرچاوە/ کتێبی پاشکۆی گۆڤاری (العربی الصغیر)، ژمارە ١٨٨، ساڵی ٢٠٠٨.

# سوودەکانی خەیارو سێو

عەباس ڕەحیم شوانی

سێو بۆ دابەزینی کێشو خەیاریش باشترین بەربەستە بۆ دروستبوونی بەردی گورچیلە:

سێو/ لەتوێژینەوەیەکی نوێدا، کەلەیەکێك لە زانکۆکانی بەریتانیا ئەنجامدرا، دەرکەوتووە کە خواردنی یەك سێو (١٥) خولەك پێش خواردنی ژەمە سەرەکییەکان، دەبێتە هۆی دابەزینی کێش، بەتایبەتی لای ئەو کەسانەی کە کێشیان زۆرە.

بەپێی ئەو توێژینەوە زانستییە، ڕێژەی لە ١٥٪ ی یەکەی گەرمیی لەشی بەشداربووەکان، کە تاقیکردنەوەکەیان لەسەر ئەنجامدرابوو دابەزیوە، پاش ئەوەی کە هەریەکەیان بەچارەکە سەعاتێك بەر لەنان خواردن سێوێکیان دەخوارد، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێکی دیاریکراو.

پسپۆڕانو شارەزایان ڕوونیان کردەوە کە خواردنی ئەو تاکە سێوە دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ئیشتیهای خواردن لای کەسەکەو بەمەش ئارەزووی خواردنی کەم دەبێتەوەو دەبێتە هۆکاری یارمەتیدەر بۆ دابەزینی کێش.

خەیار/ لە توێژینەوەیەکی زانستیی نوێدا کە ناوەندی توێژینەوە ژینگەییەکانی زانکۆی (ئەسیوت)ی میسر ئەنجامی دابوو، دەرکەوت کە خەیار باشترین چارەسەرە بۆ کێشەکانی میزەڵدانو میزەڕۆو گەورەترین بەربەستیشە لەبەردەم دروستبوونی بەردی گورچیلەدا، ئەوە جگە لەوەی کە ڕۆڵێکی کارای هەیە لەیارمەتیدانی باش هەرس کردنو نەهێشتنی ژەهراوی بوونی لاشەدا.

هەر لەو بارەیەوە، دکتۆر (عبدالسلام عاشور)ی جێگری سەرۆکی زانکۆکە بۆ کاروباری ژینگەیی، ڕایگەیاند کە خەیار یارمەتی ئاسانیی میزکردنو پاك بوونەوەی بۆری میز دەدات، جگە لەوەی کە ڕێگرێکی زۆر باشە لە بەردەم دروستبوونی بەردی گورچیلەداو خوێن پاك دەکاتەوەو ئازاری سەر ئێشەش کەم دەکاتەوە، هەروەها سوودی زۆرە بۆ ئاسانیی کاری ڕیخۆڵەکانو کەم کردنەوەی هەوکردنی سنگو شۆردنەوەی گورچیلەکانو پاککردنەوەی بۆری میزەڕۆو دابەزینی کێشی لەش، ئەوانەو جگە لەچەندین سوودی تر کە لە خەیاردا هەیە.

لە «الملف»ەوە وەرگیراوە.

# جوانتر لە ژیان دایکە

و/ مافناس/ هێمن محمد علی

ئـەم چیرۆکـە چیرۆکێکی راسـتەقینەیە، کارەکتەری رووداوەکـە خەریك بوو جوانترین شتی ژیانی لەدەست بدات... ئەو شتەی جوانترە لە تەمـەن، جوانترە لـە خۆشـییەکانی ژیان، زۆر میهرەبانە، نـەرمو نیانە، زۆر جوانترە لە دیمەنی بەهـارو گوڵو گوڵزار... دانیشـتن لە پەنایدا زۆر خۆشـترە لە دانیشـتن لە قەدپاڵی چیاو لە قەراغ رووبارێکی سازگار...

بەڵـێ... زۆری نەمابـوو دایکی لەدەسـت بـدات.. بەڵام خـودا بەزەیـی پێداهاتەوەو لە خەوی غەفلەتو بێئاگایی بێداری کردەوە..

ئەم رووداوە پەنـدو ئامۆژگاری تێدایە بۆ هەمـوو ئەو کەسـانەی کە دایکیان لـە ژیاندا ماوەو رۆژێك لە رۆژان دڵیان شکاندووە..

هەر بە منداڵی باوکم کۆچی دوایی کرد، لەو ساتەوە دایکم هەستا بە سەرپەرشتی کردنم، لە پێناوی دەسـتەبەرکردنی ژیانێکی ئاسوودە بۆ من هەموو کارێکی دەکرد، خزمەتکاری ماڵانی دەکرد، جلو بەرگی ماڵانی دەشـۆرد، نانیشـی بـۆ دەکردن... دایکم تەنهـا منی هەبوو، زۆری خۆش دەویسـتم، کاتێك ناردمی بۆ قوتابخانە زۆر دڵ خۆش بوو، هیـواو ئومێدی زۆری پێم بوو، رۆژگارەکانی منداڵیم تێپەڕینو زانکۆی پێ تەواو کردم، پاشان بەرەو هەندەران کەوتمە رێ بـۆ ئەوەی درێژە بە خوێندنەکەم بدەم، دایکم بە فرمێسـکەکانی ماڵئاوایی لێکـردمو بەدەم ئەسرینەکانییەوە پێی وتم: کوڕەکەم لەهەواڵت ئاگادارم بکەو هەرگیز لە بیرم نەکەی هەروەك لە بیرت ناکـەم... دوای ماوەیەکی دوورو درێژ خوێندنم تـەواو کردو بووم بە کەسـێکی تر، شارسـتانی رۆژئاوا زۆر کاری تێکردبوومو زۆر باوەڕم بە ژیانی ماددیەت هەبوو..

وەزیفەیەکی بەرزم بۆ خۆم مسۆگەر کردوو دەگـەڕام بۆ ئـەوەی ژیانـی هاوسـەریش پێك بهێنم... دایکـم ئافرەتێکی بۆ دیاری کردم بەڵام بەداخەوە بە قسەم نەکردو خۆم ئەو هاوسەرەی ژیانم دیاری کرد... هەر لە شەش مانگی یەکەمی هاوسەریمان هەستم کرد رقی لە دایکمەو خۆشی ناوێت، هەتا ئـەو رۆژەی کە هاتمەوە بۆ ماڵەوە، دەبینم هاوسەرەکەم دەگری..

وتم: بۆچی دەگریـت؟ زۆر بە توڕەییەوە وەڵامی دامەوەو وتی: یان من یان دایکت دەبێت لەم ماڵە نەمێنێت!! ئیتر ئارامم نەماو ناتوانم لەگەڵ دایکتدا بژیم!!

بەداخەوە هەر بە زوویی بە قسـەم کردو ئەو هەموو سۆزو خۆشەویستییەی دایکمم لەبیر چوو..

بەڵـێ ... دەرمکرد... بەڵام لەم کاتەشـدا بەچاوی پڕ فرمێسـکەوە دەسـتی بۆ ئاسـمان بەرز کردەوەو دەیوت: کوڕم خودا سـەرفرازو سەرکەوتووت بکات..

لە پێنـاوی ئەوەی من ماڵو ژیانم لێ تێك نەچێت رۆی... سـەیری ئەو دڵە فراوانە بکە.. سەیری ئەو سۆزو بەزەییە بکە، بە دڵنیاییەوە لە دەریاکان فراوانترو قووڵترە..

دوای چەند کاتژمێرێك، ئەوسا زانیم چیم بە خۆم کرد، هەسـتامو کەوتمـە رێو زۆر بە دوایدا گەڕام نەمدۆزیـەوە... کاتێك گەڕامەوە هاوسەرەکەم بە هەر شێوەیەك بێت وای لێکردم کە ئەو بابەتە بیر خۆم بەرمەوە..

دایکم لێ ون بوو، بە هیچ شێوەیەك هەواڵیم نەدەزانی... لەو ماوەیەدا تووشی نەخۆشییەکی سەخت هاتمو لە نەخۆشخانە خەوێنرام... زۆر لاوازو بێهێز بووم.. دایکم بە نەخۆشییەکەمی زانیبوو، بەهەواڵ پرسـین هاتبوو بۆ لام، بەڵام پێش ئەوەی بە دیداری شـادبم هاوسـەرەکەم رێگەی لێگرتبوو، نەیهێشتبوو بێتە ژوورەوە بۆ لامو پێـی وتبوو: چیت لێمان دەوێت؟! لێرەش وازمان لێناهێنیت؟!

دایکم لـە کوێوە هاتبوو، بۆ ئـەو جێگەیە رۆیشتبۆوە.. دوای ماوەیەکی زۆرو چارەسەرێکی دورو درێـژ لە نەخۆشـخانە هاتمـە دەرەوە.. وەزیفەو کارەکەم لەدەسـت دا، باری دەروونیم زۆر تێك چووبوو... قەرزێکی زۆریشـم لەسـەر کەڵەکـە ببـوو، هەمـوو ئەمانـەش بـە هۆی داواکارییە زۆرەکانی هاوسـەرەکەمەوە توشـم هـات، کـە بـەردەوام داواکارییەکانـی زیادیان دەکـرد... بە تـەواوی ماندووی کـردم.. ئالەم کاتە ناسكو هەستیارەدا هاوسەرەکەم پێی وتم: مادام پلـەو پایەو جێگەو رێگەت لە کۆمەڵگەدا لەدەسـت دا، بەراشـکاوی پێـت دەڵێم: من تۆم ناوێتو تەڵاقم بدە!!

ئەم قسەیە هەروەکو هەورە گرمە وابوو لە گوێمدا، زۆر باوەڕم نەدەکرد، کە هاوسـەرەکەم ئەم قسانە بکات.. چارم نەما تەڵاقم دا..

لـە دوای ئـەم رووداوە، زۆر گەڕام بەدوای دایکمدا، هەتا دۆزیمەوە، بەڵام لەکوێدا؟!

لەشـوێنی لانـەوازانو بـێ کـەسو کارو بێ جێگـەو رێگەکاندا!! لەلای ئەو کەسـانەی کـە شـوێنێکیان نییـە تیایـدا بژیـن... لەو شـوێنەی خەڵکی خێری پێدەکـردنو لەنانو ئـاوی خێرخوازانیـان دەخـوارد... ئـای لەم شەرمەزاریە!!

کاتێـك بینیم خـۆم دا بەسـەر قاچەکانیداو بەفرمێسـکەکانم قاچەکانیم تەرکـرد... ئەویش خۆی بـۆ نەگـیراو لەگریانەکەمدا بەشـدار بوو.. لەگـەڵ خـۆم هێنامـەوەو پەیمانـم دا هەتا ماوم خزمەتـکاری بکەم... بەڵێ تێگەیشـتم کە ژیان بە بێ دایك بوونی ئەستەمەو زۆر دژوارو نارەحەتە..

خوێنەری ئازیـز: ئەزانی ئازاردانی دایكو باوك تاوانێکی گەورەیە، تاوانێکە هەر لەژیانی دونیادا سزاکەی دەچێژێت!!

سەرچاوە: کما تدین تدان.

# قۆناغی بنەڕەتیو کاری پەروەردەیی

جەمال موحەمەد ئەمین

جیهانی منداڵ ئەو جیهانە پاكو بێ لەكەیەیە كە هێشتا تۆزو گەردی لەسەر نەنیشتووە، ئەو ئاسمانە شینو سافە دڵرفێنەیە كە هێشتا دەستی هەوری ڕەشو چڵكنی پێ نەگەیشتوە، تا ڕەونەقو شینابیەكەی بشارێتەوە، جیهانی منداڵ ئەو تۆمارە سپیو بێگەردەیە كە هێشتا نوكی قەڵەمی ڕەشی نەچۆتە سەرو پەڕەكانی بە سپێتی ماونەتەوە، ئەو كاسێتە یان سیدییە بۆشو بەتاڵەیە كە هێشتا هیچی لەسەر تۆمار نەكراوەو چاوەڕوانی پڕكردنەوەیەو هەرچییەكی لەسەر تۆمار كرا هەروەك نەخشی سەر بەرد وا دەبێتو سڕینەوەی زۆر زەحمەت دەبێت.

كاری مامۆستا لە قۆناغی بنەڕەتیدا كە بریتییە لە پەروەردەو فێركردن، گەورەترینو گرانترین كارێكە لەم بوونەدا (كاد المعلم ان یكون رسولا)، ئەو كارە گرنگو گرانە بریتییە لە دروستكردنو بنیاتنانی كەسایەتی مرۆڤێك كەوا لە سەرەتای ژیانیدایە، كە بەزۆری قوتابیانی پۆلی یەكو دووی بنەڕەتی دەگرێتەوە، بە گشتی كرداری پەروەردەكردن بنیاتنانەوەی مرۆڤە لەسەر بنچینەی بەرنامەو پرۆگرامێكی داڕێژراوی زانستی بۆ ئەو مەبەستە ئەو كردارەش مامەڵە كردنە لەگەڵ كۆمەڵێكی جۆراو جۆر لە ڕووی بیروبۆچوونو دەروونو كەسایەتی جیاجیاوە، ئەمە لەكاتێكدا كە ئەو كردارە لە قۆناغی بنەڕەتیدا مامەڵە كردنە لەگەڵ كۆمەڵێك منداڵی پاكو خاوێنی وا كە هێشتا هیچ زانیارییەك لەسەر مێشكی بێگەردیان تۆمار نەكراوە، ئینجا گرنگیو بایەخی ئەو پەروەردە كردنە لەو قۆناغەدا لەو خاڵەوە دەست پێدەكاتو سەرچاوە دەگرێت، چونكە لەو قۆناغەی ژیانیدا هەر چییەك فێری ئەو منداڵە كراوە ئەوا بە درێژایی تەمەنی لەگەڵیدا دەمێنێتو زۆر بە زەحمەت لێی جیا دەبێتەوە، لەو قۆناغەدا منداڵ كەسایەتی خۆی چرۆ دەكاتو بەرەو سەوزبوونو پێگەیشتن دەڕوات، بەو پێیە ئەگەر قوتابییەكی پۆلی یەك یان دوو لەسەر بەرنامەیەكی ڕاستو دروستو زانستیانە پەروەردەكرا ئەوا كارو ئاسەواری ئەو پەروەردەیە ڕەنگدانەوەی دیاری دەبێت لەسەر ڕەوتی ژیانی ئەو منداڵە بە درێژایی تەمەنی، بۆ نموونە ئەو منداڵەی كە لەو قۆناغە سەرەتاییەدا یان زووتریش فێری ئەوە دەكرێت كە درۆ نەكات، چونكە خوای گەورە درۆزنی خۆشناوێت ئەوا ئیتر ئاسەواری ئەو پەروەردەیە لەسەری دەمێنێتو لە ناو هاوڕێكانیدا بەردەوام باسی دەكات، ئیتر بەو جۆرە ئەگەر ئەو منداڵە بە شتی باش پەروەردە كرا ئەوا باش دەردەچێتو بە پێچەوانەشەوە.

كاتێك منداڵ بۆ یەكەم جاری دەچێتە قوتابخانە لەگەڵ خۆیدا كۆمەڵێك حەزو ئارەزووی جیا جیا دەبات، داناییو سەلیقەیی مامۆستای بنەڕەتی لەوەوە دەردەكەوێت كە تا چەند دەتوانێت وەڵامی حەزو ئارەزووەكانی ئەو منداڵە بداتەوەو چۆن زەمینەیەكی لە باری وا دەڕەخسێنێت بۆی تا حەزو ئارەزووەكانی بەرجەستە بكات.

لە هەمان كاتدا پێویستە مامۆستای ئەو قۆناغە خاوەنی دڵێكی زۆر گەورە بێتو زۆر بە ئارامو خۆڕاگربێت بەرامبەر داواو حەزو خولیاكانی ئەو منداڵە چاو گەشانەی وان لە بەردەستیاو هەرگیز بێتاقەتیو تووڕەییو توندو تیژی بەكار نەهێنێت، چونكە توندوتیژیو هەڕەشە وا لەو منداڵە دەكات كە لە قوتابخانە ڕابكاتو هەڵ بێت، جگە لەوەی كە كەسایەتییەكی لاوازی بۆ دروست دەبێت، مامۆستای كارامەو سەركەوتوو بەوە پێوانە دەكرێت كە تا چەند دەتوانێت قوتابخانەو خوێندن لە بەرچاوی ئەو منداڵانە شیرین بكات.

لێرەدا واباشە كە چەند خاڵێك بخرێنە بەرچاو كە پێویستە ڕەچاو بكرێن لە پرۆسەی پەروەردەكردن لەو قۆناغە زووەی خوێندندا:

١- پێویستە مامۆستای قۆناغی بنەڕەتی بەتایبەتی پۆلی یەكو دوو شارەزاییەكی تا ڕادەیەك باشیان هەبێت لە دەروونزانی منداڵدا.

٢- مامۆستای ئەو قۆناغە شارەزابێت لە پێكهێنەرە دەروونیو كۆمەڵایەتیو كەسایەتییەكانی قوتابیەكانی.

٣- دەبێت مامۆستای ئەو قۆناغە زۆر دڵ گەورەو بە ئارامو خۆڕاگربێت زیاتر لە مامۆستای قۆناغەكانی دیكە.

٤- هەتا دەتوانێت مامۆستای قۆناغی بنەڕەتی هۆكانی ڕوونكردنەوە بە تایبەتی ئەوانەی نزیكن لە جیهانی منداڵەوە بەكار بهێنێت.

٥- پێویستە مامۆستای قۆناغی بنەڕەتی زۆر ڕووخۆشو قسەخۆشو دەم بە پێكەنین بێتو خۆی بە دوور بگرێت لە تووڕە بوونو توندو تیژیو پیاهەڵشاخان.

## وانەیەك بۆ ژیان

گوڵێك بە دیاری بدەیتە مرۆڤێك كاتێك لە ژیاندایە، باشترە لە چەپكە گوڵێك كە لەسەر گۆڕەكەی دایبنێیت!



نەسیم سەمادی
سەرنووسەری (خلاصات - المختار الاداري - علاقات)

# ئایا ڕقت لە کارەکەتە؟

وەڵامەکەت بەڵێ یاخود نەخێر بێت، زۆربەی خەڵکی ڕقیان لە کارەکەیانەو حەز بە کارەکەیان ناکەن، مرۆڤ بونەوەرێکی نامۆیە، ئەوەی هەیەتی ڕقی لێ دەبێتەوەو بۆ ئەو شتەی کە نییەتی هەوڵ دەدات.

هەمیشە پێی وایە ئەو زیاتر بەختەوەرو خۆشنود دەبێت ئەگەر لە شوێنێکی تر بوایە، یان پیشەو کارێکی تری ئەنجام بدایە، بەڵام ئەوە لە ڕاستییەوە دوورە، چونکە کێشەو چارەسەر هەموو دەمێك لە ناخی کەسەکە خۆیدایە نەك لە ناو شوێنەکەی.

بۆ هەر کوێیەك بچیتو لە هەرکوێیەك کار بکەیت... ئەوا تۆ تۆیت! لەبەرئەوەی هەمیشە خۆتت لەگەڵ خۆتدا هەڵگرتووەو هەستەکانت لە ناختدا چڕ کردۆتەوە.

لە ڕاستیدا ئەگەر کارەکەتت پێ خۆش نییەو ڕقت لێی دەبێتەوە... ئەوە شتێکی نامۆ نییە... کێشەکە لە خودی خۆتدایە نەك کارەکەت.

گرنگ نییە ئەوەی کە لە خۆمانو دەوروبەرمان دا ڕوودەدات، گرنگ چۆنییەتی وەڵامدانەوەمانە لە کاتی خۆیدا بۆ ئەوەی ڕوودەدات، کارەکەت تۆ هەڵت بژاردووەو قبوڵت کردووە، ئەگەر ڕقت لێ دەبێتەوە هەر لەبەرئەوەیە هیچ زانیاریو شارەزاییو پەیوەندییەکت نییە کە پێویست بێت بۆ گۆڕینی کارەکەت، تۆ بەرپرسیاری یەکەمی لەوە... وانییە؟

دەتوانیت کەمێك لەگەڵم بیر بکەیتەوە...

کارێکی باشو گونجاو بە تەواوی بۆ هیچ کەسێ بوونی نییە، ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە ئەوەیە خۆمان کارەکەمان خۆش بکەینو بیگونجێنین، واتە پێویستە لەسەرت جیهانێ بۆخۆت بخوڵقێنێت، بە خوڵقاندنو دروستکردنی ئەو جیهانەی کارەکەشیت دەخوڵقێنی...

هەرچەند بگەڕێیت... چەند بپرسیت: کارێکی تەواو بە پێی ئەو پێوانەیەی دەتەوێ نادۆزیتەوە!

وتەیەکی بەناوبانگ هەیە ماناکەی ئەوە دەگەیەنێت ئێمە کاتێك کارەکەمان خۆشویست، ناچاری کارکردن نابین هەرگیز... بەختەوەر ئەو کەسەیە کە کارو پیشەکەی ئارەزوویەتی نەك خوێندنەکەی...

پێویستە لەسەر کارەکەی ئێستات خۆت ڕابهێنیو بگونجێنی... دروستی بکەو چاو بە تایبەتمەندییەکانی دا بخشێنەرەوە، فراوانی بکەو مانایەکی نوێی پێ ببەخشە، باشی بکە، بەهاو قیمەتی لەکەسایەتی خۆت بخەرە سەر.. خۆت ڕابهێنە تا دەگونجێی لەگەڵیدا.

ئەگەر گریمانەیەك دابنێینو بڵێین: ئەو کارەی کە غەیری ئەوت چنگ ناکەوێتو گونجاو نییە. ناشگونجێت لەگەڵ بەهاو بنەماکانت دا... ئەی بۆچی قبوڵی دەکەیتو پاشان سکاڵای دەکەیت؟

بۆ دەست لەم کارەی ئێستات ناکێشیتەوەو خۆت لە جیهانی کارەکان دا ئازاد ناکەیت؟

باشترین کار لەم جیهانەدا... ئەوەیە کە خۆمان هەڵسین بە داهێنان کاری تیایداو بژین تیایدا...

دەیان کاری تری نوێی بۆ زیاد دەکەینو کە ئامادەی دەکەین بۆ کەسانی تر کە داوای کار دەکەن.

ئەگەر زاتی ئەوەت کرد کە پیشەیەك بۆ خۆتو کەسانی تر بخوڵقێنی ئەوا هۆکاری وازهێنانو قبوڵ نەکردنی پیشەکەی ڕابردووت بیر نەچێت، هەوڵ بدە ئەو کارانەی بۆ کەسانی تری دەست دەخەیت خۆشو ویستراو بن، هەندێ لە کەسانی تریش وەك خۆتن ڕقیان لە کارەکانیان دەبێتەوە... پێویستە لەسەرت خۆشت بوێن... هەتا ئەو کارەی پێشکەشیان دەکەیت خۆشیان بوێت.